# انجیلی مقدسی

رب و خلاصکری مه

یسوع مسیح

که

له زمانی اصلی یونانی

ترجمه کراوه

و به بَیبل سوسائیتئی امریکا

و بریتش و فورن بَیبل سوسائیتئی

چاپ کراوه

—o—

١٩١٩

# انجیل متی

## باب ۱ ـ

۱ کتیبی بولد بونی یسوع مسیح کوری داود کوری ابراهیم *
۲ ابراهیم اسحقی تولد کرد : واسحق یعقوبی تولد کرد : و یعقوب
۳ یهودای و برایانی وي تولد کرد * ویهودا فارص و زارحی له تاماری
تولد کرد : و فارص حصرونی تولد کرد : و حصرون آرامی تولد
۴ کرد * و آرام عمّینادابی تولد کرد : و عمّیناداب نحشونی تولد کرد:
۵ و نحشون سلمونی تولد کرد * و سلمون بوعزی له راحابی تولد کرد :
۶ و بوعز عوبیدی له راعوتي تولد کرد : و عوبید یسّای تولد کرد* و یسّا
۷ داود پادشای تولد کرد : و داود سلیمانی له ژنی اوریای تولد کرد * و
سلیمان رحبعامی تولد کرد:و رحبعام ابیّای تولد کرد:و ابیّا آسافی تولد
۸ کرد * و آساف یهوشافاطی تولد کرد : یهوشافاط یورامی تولد کرد :
۹ و یورام عزیّای تولد کرد * و عزیّا یوتامی تولد کرد : و یوتام احازی
۱۰ تولد کرد : و احاز حزقیّای تولد کرد * و حزقیّا منسّي تولد کرد :
۱۱ و منسّی اموصی تولد کرد : و اموص یوشیّای تولد کرد * و یوشیّا
یکونیای و برایانی وي تولد کرد ده وختی یخسیری بابلدا *
۱۲ و له پاش یخسیری بابل یکونیا سالتئیلی تولد کرد : و سالتئیل

۱۳ زروبابلی تولد کرد * و زروبابل ایهودی تولد کرد : و ایهود ایلیاقیمی
۱٤ تولد کرد : و ایلیاقیم عازوری تولد کرد * و عازور صـادوقی تولد
کرد : و صادوق اکیمی تولد کرد : و اکیم ایلیهودی تولد کرد *
۱٥ وایلیهود ایلیعازری تولد کرد : و ایلیعازر متّانی تولد کرد : و متّان
۱٦ یعقوبی تولد کرد * و یعقوب یوسفی تولد کرد : میردی مریمی که
له وی یسوع بولد بو : اوی که مسیح بانگ د کری *
۱۷ دنا همو سلسلان له ابراهیم هتا داود چوارده سلسلن : و له داود هتا
یخسیری بابل چوارده سلسلن : و له یخسیری بابل هتا مسیح چوارده
سلسلن *
۱۸ بلّا بولد بونی یسوع مسیح وها بو : وختیکی مریم دایکی وی به
یوسف دزگیران بو : له پیش اوی که هاتنه پیکوه : بیدا کرا که له
۱۹ روح القدوس آوس بو * و یوسف میردی وی که صادق بو و
نیدویست که اوی رسوا بکا : ده فکر دا بو که اوی به دزی برلا بکا *
۲۰ بلّا وختیکی او لسر اوانی فکر د کرد : اوتا ملایکتی رب ده خونیکیدا
بو وی اشکرا بو : ای یوسف کوری داود مترسه که مریم ژنی خوت
۲۱ قبول بکی : چونکه اوی که ده ویدا هامله بوه له روح القدوسه * و
کوریکی دزی و نیوی وی یسوع بانگ د کی : چونکه او قومی خوی
۲۲ له کناحانی وان خلاص د کا * بلّا اوه همو بو هتا کو تواو ببی او
۲۳ چتی که له خلّا کتراوه به دستی پیغمبر که دلّی * اوتا بیکریك آوس
دبی و کوریکی دزی و نیوی وی عمانوئیل بانگ د کن : که به

٢٤ ترجمه معنایه : خلّا د گك امه * و كه یوسف له خـوی هلستا : چلونیكی
ملایكتی رب به وی امری كردبو كردی و ژنی خوي قبول كرد *
٢٥ و اوی نناسی هتا كوریكی زابو : و نیوی وی یسوعی بانگ كرد *

## باب ٢

١ و كه یسوع بولد بو ده بیت لحمی یهودیه ده روژانی هیرودیس پادشا
٢ دا : اوتا مجوسیان له روژ هلاتی بو اورشلیمی هـاتن * دیان گت :
لكویه اوی كه پادشای یهودیان بولد بوه ؟ چونكه استیری ویمان دیوه
٣ ده روژ هلاتیدا و هاتوین كه سجدی لی بكین * بلّا وختیكی هیرودیس
٤ پادشا اوی بیست تیك چو و همو اورشلیم د گك اوی * و همو كاهنانی
گوره و خویندوارانی قومی خر كرد و پرسیاری له وان كرد لكوی
٥ مسیح دبا بولد ببی * و اوان به ویان گت : ده بیت لحمی یهودییدا :
٦ چونكه وها نوسراوه به دستی پیغمبر * و اتو ای بیت لحم ده ولاتی
یهودییدا هیچ چكولتر نی لنیو سردارانی یهودیه : چونكه له تو مزنیك
وەدر د كوی كه قومی من اسرائیل شوانی د كا *
٧ او وختی هیرودیس به دزی مجوسیانی بانگ كرد و پرسیـاری
٨ چاكی له وان كرد له وختی اشكرا بونی استیری * و اوانی نارده بیت
لحمی و كتی : برون و سوراغی چاك بكن بحثی او مندالی : و كـه
٩ پیداو كردوه به من خبر بدن هتا كو امنیش بیم و سجدی لی بكم *
و كه اوان قصـی پادشایان بیستبو روین : و اوتا او استیری كه ده روژ

هلاتیدا دیبویان لپیشی وان دچو هتا هات و راوستا لسر او جي کـه
١٠ مندالکه لوی بو * و که استیره‌یان دی به خوشحالییکی زور گـوره
١١ خوشحال بون * و که وەژور مالی کوتن او منداله‌یان دگـل مریم
دایکی خوی دی : و کوتنه خواری و سجدییان لی کرد : و خزینی
١٢ خویان کردوه و دیاریانیان بو وی هینا : زیر و کُندر و مُرا * و که
ده خـَونیکیدا له خلاّی هوشیار کرابون که نگَرینوه کن هیرودیس :
١٣ به رییکی دیکه بو وطنی خویان چون * و که اوان چوبون : اوتا ملایکتی
رب ده خـَونیکیدا بو یوسف اشکرا بو دیگت : هلسته : منـدالکه و
دایکی وی هلگره و هلی بو مصر و لوی به هتا به تو بلّیم : چونکه
١٤ هیرودیس لو مندالی دگـَری که اوی هلاك بـکا * و او هلستا :
١٥ مندالکه و دایکی وی به شوی هلگرت و چو بو مصر * و لوی بو هتا
مردنی هیرودیس : هتا کو تواو ببی او چتی که له خلاّی کتراوه به
دستی پیغمبر که دلّی : کوری خومم له مصری بانگ کردوه *
١٦ وختیکی هیرودیس دیتی که له مجوسیان مسخره کرابو : رقی زور
هلستا و ناردی و همو مندالانی کُشت ده بیت لحم و ده همو سرحدانی
وی دا که دو سال و کمتر بون : به حسابی او وختی که له مجوسیان
١٧ پرسیاری چاکی کردبو * او وختی تواو بو او چتی که کتراوه به دستی
١٨ یرمیا پیغمبر که دلّی * دنگیك ده رامـیدا بیسترا : گریان و شینی زور .
راخیل بو مندالانی خوی دگریا و سره‌خوشی قبول ندکرد : چونکـه
نامأون *

١٩ بلا وختیکی هیرودیس مردبو : اوتا ملایکتی رب ده خَونیکی ده
٢٠ مصر دا بو یوسف اشکرا بو دیگت * هلسته : مندالکه و دایکی وی
هلگره و برو بو ولاتی اسرائیل : چونکه اوانی که له گیانی او مندالی
٢١ دگَران مردون * و او هلستا : مندالکه و دایکی وی هلگرت و هاته
٢٢ ولاتی اسرائیل * بلا وختیکی بیستی که ارکلاوس ده جي هیرودیس
بابی خویدا لسر یهودیه پادشایتی دکرد : ترسا که بو اوی بچی : بلا که
٢٣ ده خَونیکیدا له خلای هوشیار کرابو : بو لای جلیلی چو * و هات و
رونیشت ده شاریکیدا که ناصرت بانگ دکرا : هتا کو تواو ببی او
چتی که به دستی پیغمبران کتراوه : که او ناصری بانگ دکری *

## باب ٣

١ داو روژاندا یوحنّا تعمیددر هات و ده چولی یهودییدا وعظی دکرد *
٢ــ٣ دیگت : توبَی بکن چونکه پادشایتی آسمان نیزیك بوه * چونکه اویه
اوی که له وی کتراوه به دستی اشعیا پیغمبر که دلّی : دنگی بانگکریکی
ده چولیدا دلّی : ریی رب حاضر یکن و جادانی وی راست بکن *
٤ و او یوحنّا جلّی له توکی وشتری بو و پشتیندیکی چرم ده پشتیدا :
٥ و خوراکی وی کولّه و هنگوینی کیوی بو * او وختی اورشلیم و همو
٦ یهودیه و همو ولاتی دوری اردن وەدر کوتنه کن اوی * و له وی
تعمید دکران ده چومی اردن دا به اقرار کردنی گناحانی خویان *
٧ بلا وختیکی دیتی که زوران له فریسیان و صدوقیان دهاتنه تعمیدی :

به وانی گت : ای اولادی ماران : کی به انگوی نیشان دا که هلین
٨ـ٩ لو غضبی که دی ؟ * دنا میوی لایقی توبـَی بینن * و فکر مکن که
ده خوتاندا بلّین : امه ابراهیممان هیه بو باب : چونکه به انگو دلّیم
١٠ که خلّا دتوانی له او بردانه مندالان بو ابراهیمی هلبستینی * و الان
بیور لکن رگی داران داندراوه : دنا هر داریکی که میوی چاك
١١ نایِنی دبردری و ده آوری داویژری * امن انگو به آوی تعمید دکم
بو توبـَی : بلّا اوی که له دوای من دی : له من به قوت تره : که امن
لایق نیم که کوشی وی هلگرم : او انگو به روح القدوس و آور
١٢ تعمید دکا * که بیژینگی ده دستی خوی دایه و جوخینی خوی پاك دکا
و گنمی خوی ده امباریدا خر دکاتوه : بلّا کاکه دسوتینی به آوریکی
که ناکوژیتوه *
١٣ او وختی یسوع له جلیلی هاته اردن بو کن یوحنّا که له وی تعمید
١٤ بکری * بلّا او منعی لی دکرد دیگت : امن احتیاجم هیه که له تو
١٥ تعمید بکریم و اری اتو بو کن امن دیی ؟ * و یسوع جوابی دا و به
وی گت : لی گری اویستا : چونکه وها بو مه لایقه که همو صداقتی
١٦ تواو بکین : او وختی لي گرا * و که یسوع تعمید کرابو : جی بجی
له آوی وەدر کوت و اوتا آسمانان اواله بونوه و روحی خلّای دی
١٧ وکو کوتریك دهاته خواری و هاته سر اوی * و اوتا دنگیك له
آسمانان دیگت : اویه کوری خوشوستی من که له وی خوشحالم *

## باب ٤

١ او وختی یسوع به روح بو چولی وەسر بردرا هتاکو له شیطــان
٣:٢ تجربه بکری * و که چل شو به روژو ببو : له پاشان برسی بو * و تجربه
کر که هاته پیش و به وی گت : اگر اتو کوری خلاي : بلّی که او
٤ بردانه ببن به نان * بلا او جوابی دا و کتی : نوسراوه : انسان نه تنیا
به نان دژی بلا به هر قصیکی که له زاری خلای وەدر دکوی *
٥ او وختی شیطان اوی بو شاری مقــدس برد و اوی لسر قوبّی
٦ هیکلی دانا * و به وی گت : اگر اتو کوری خلاي : خوت باویژه
خواری : چونکه نوسراوه که به ملایکتانی خوی درحقی تو امر دکا
٧ و اتو لسر دستان هلدگرن نبا پبی تو وەبردیکی بکوی * یسوع به وی
گت : دیسان نوسراوه : رب خلای خوت تجربه مکه *
٨ دیسان شیطان اوی برده سر کیویکی زور بلند و همو پادشایتانی
٩ دنیایی و جلالی وانی به وی نیشان دا * و به وی گت : اوانه همو به
١٠ تو ددم اگر بکوی و سجدی من بکی * او وختی یسوع به وی گت :
برو ای شیطان چونکه نوسراوه : دبی رب خلای خوت سجدی بکی
١١ و تنیا به وی عبادت بکی * او وختی شیطان اوی بجی هیشت و اوتا
ملایکتان هاتنه پیش و خذمتی ویان دکرد *
١٢ بلا وختیکی بیستی که یوحنّا تسلیم کرابو : بو جلیــلی چــو *
١٣ و ناصرتی بجی هیشت وهات و رونیشت ده کفرناحومیدا لکن بحری

١٤ ده سرحدانی زبولون و نفتالیمیدا * هتا کو تواو ببی او چتی که کتراوه
١٥ به دستی اشعیا پیغمبر که دلّی * ولاتی زبولون و ولاتی نفتالیم : ریی
١٦ بحری : او لای اردن : جلیلی طایفان * او طایفی که ده تاریکایـدا
رودنیشت روناکاییکی گوری دیوه : و بو اوانی کـه ده ولاتی و
سیبری مردنی رودنیشتن روناکای هلاتوه *
١٧ له او وختیـوه یسوع دستی پی کرد که وعـظ بکا و بلّی : توبـی
١٨ بکن چونکه پادشایتی آسمان نیزیك بوه * و که لکن بحری جلیلی
دگرا : دو برایان : شمعون که پطروس بانگ دکری و اندریّاس
برای وی دی که توریکیان ده بحری داویشت: چونکه توروان بون *
١٩ و به وانی گت : له دوای من ورن و انگو دکمه تورووانی انسانان *
٢٠ و اوان جی بجی تورانیـان بجی هیشت و وه‌دوای وی کـوتن *
٢١ و که له اوی وه‌پیش دکوت دو برایانی دیکه : یعقوب کوری زبدی
و یوحنا برای وي دی ده گمیدا دگل بابی خویان زبدی تورانی خویان
٢٢ دچنیوه : و اوانی بانگ کرد * و اوان جی بجی گمی و بابی خویان
بجی هیشت و وه‌دوای وی کوتن *
٢٣ و ده همو جلیلیدا دگرا و ده کنشتی واندا تعلیمی ددا و انجیلی
پادشایتی وعظ دکرد و همو نخوشی و همو دردی لنیو خلکی صـاغ
٢٤ دکردوه * و نیوبانگی وی وه‌در کوت ده همو سوریـیـدا : و همو
نخوشان که به جوی جوی نخوشیان و دردان اذیتیان دکیشا و جنّداران
٢٥ و فیداران و افلیجانیان هینا کن اوی و اوانی صاغ کردوه * و جماعتانی

زور له جلیـلی و دیکاپولسی و اورشلیمی و یهودیـی و لو لای اردن
وەدوای وی د کوتن *

## باب ٥

١ و که جماعتانی دی چو سر کیوی : و که او رونیشتبو شاگردانی
٢ وی هاتنه کنی * و زاری خوی کردوه و اوانی تعلیم ددا دیگت *
٣:٤ خوزگه به فقیران ده روحدا : چونکه پادشایتی آسمان ایوانه * خوزگه
٥ به خمداران : چونکه به وان دلخوشی ددری * خوزگه به صبرداران :
٦ چونکه اوان ارضی به میرات دگرن * خوزگه به برسیان و تینوان بو
٧ صداقتی : چونکه اوان تیر دبن * خوزگه به رحمکران : چونکه به وان
٨ رحم دکری * خوزگه به پاکدلان : چونکه اوان خـلای دبینن *
٩ خوزگه به صلحکران : چونکه اوان مندالانی خلای بانگ دکرین *
١٠ خوزگه به اوانی که لبر صداقتی اذیت دکیشن : چونکـه پادشایتی
١١ آسمان ایوانه * خوزگه به انگو وختیکی جنیو و اذیتو ددن و چتیکی
١٢ خراپ به درو لسر انگو دلین بو خاتری من * شاد بن و کیفخوشی
بکن : چونکه حقی انگو ده آسماندا زوره : چونکه هر وا به پیغمبران
ده پیش انکودا اذیتیان داوه *
١٣ انگو خُوي ارضین : بلا اگر خُوی بی تـام ببی بـه چی خُوی
دکری ؟ ایدی بو هیچ چتیك فایدی نیه بجگه که فری بدریته دری
١٤ و له خلکی پامال بکری * انگو روناکای دنیاین : شاریکی که لسر

١٥ کیوی داندراوه ناتوانی شاردراو ببی * چرایکی هلناکن و لبن کیلی
دابنین : بلّا لسر پیچرا و به همو اوانی که ده مالی دان روناکای
١٦ ددا * هر وا : با روناکای انگو لپیش خلکی روناکای بدا هتا کو
عملانی چاکی انگو ببینن و شکری بابی انگو بکن که ده آسمان
دایه *
١٧ فکر مکن که امن هاتوم که شریعت یان پیغمبران بطال بکم .
١٨ ناهاتوم که بطال بکم بلّا که تواو بکم * چونکه راستی به انگو دلّیم :
هتا ارض و آسمان رابرن یودیك یان نُختیك له شریعت قط رانابری
١٩ هتا همو تواو ببی * دنا هر کس که یکیك لو حکمانی چکوله‌تر
بطال بکا و خلکی وها تعلیم بدا : ده پادشایتی آسماندا چکوله‌تر بانگ
دکری : بلّا هر کس که اوانی بجی بینی و تعلیم بدا : او ده پادشایتی
٢٠ آسماندا گوره بانگ دکری * چونکه به انگو دلّیم : اگر صداقتی
انگو له ای خویندواران و ای فریسیان زیاتر نبی : قط وه‌ژور پادشایتی
آسمان ناکون *
٢١ بیستوتانه که به قدیمیان کتراوه : قتلی مکه : و هر کس که قتلی
٢٢ بکا لایقی حکم دبی * بلّا امن به انگو دلّیم : هر کس که له برای
خوی رقی هلبستی : لایقی حکم دبی : و هر کس که به برای خوی
راقا بلّی : لایقی مجلیسی کخدایان دبی : و هر کس که احمق بلّی :
٢٣ لایقی آوری جهنمی دبی * دنا اگر قربانی خوت بو کن مذبحی بینی
٢٤ و لوی وه‌بیرت بی که برات چتیکی لسر توی هیه * قربانی خوت

لوی لپیش مذبحی بجی بیله و برو هول د گل برای خوت آشت بـوه:و
۲۵ او وختی وره و قربانی خوت بینه * د گل مدعی خوت زو ریك بكوه
که هیشتا د گل اوی ده ری دای : نبا مدعیکه اتو به قاضی تسلیم بکا
۲۶ و قاضی به داروغه و ده بندیخانیدا باویژري * راستی به تو دلّیم : قط
له اوی وه‌در نا کوي هتا پولی آخرت ادا نکردوه *
۲۸:۲۷ بیستوتانه که کتراوه : زناحی مکه * بلّا امن به انگو دلّیم : هر
کس که تماشای ژنیکی بکا هتا کو طمای لی بـــکا : الان ده دلّی
۲۹ خویدا د گـــل اوی زناحی کردوه * و اگر چـــاوی راستی تو هلّت
بنگوینی دری ینه و له خوت فری بده : چونکه قازانجه بو تو کـــه
۳۰ یکیك له اعضایانی تو هلاك ببی و همو بدنت ناویژریته جهنمی * و
اگر دستی راستی تو هلت بنگوینی ببره و له خوت فری بده : چونکه
قازانجه بو تو که یکیك له اعضایانی تو هلاك ببی و همو بدنت ناویژریته
جهنمی *
۳۱ و کتراوه : هر کس که ژنی خوی برلا بکا بـــا طلاقنامه بـــه
۳۲ وی بدا * بلّا امن به انگو دلّیم : هر کس که ژنی خوی برلا بکا به
بی سببی زناح : باعیثی زناح کردنی وی دبی : و هر کس کـــه
برلا کراویکی ماره بکا زناح د کا *
۳۳ دیسان بیستوتانه که به قدیمیان کتراوه : سوینـــدی درو مخو بلّا
۳۴ سویندانی خوت بو خلّای ادا بکه * بلّا امن به انگو دلّیم : قط سویند
۳۵ مخون : نه به آسمان چونکه تختی خلّا یه * و نه به ارضی چونکه پی

راخری پیانی وی یه : و نه به اورشلیمی چونکه شاری پادشای گوره
٣٦ یه * و به سری خوتیش سویند مخو چونکه ناتوانی مویکی سپی یان
٣٧ راش بکی * بلّا با قصی انگو بلی بلی و نه نه ببی و اوی که له اوانه
زیاتره له شری یه ※

٣٨:٣٩ بیستوتانه که کتراوه : چاو بو چاو و ددان بو ددان * بلّا امن به
انگو دلّیم که ضدی شری هلمستن بلّا هر کس که له رومتی راستی
٤٠ تو ددا اوی دیکشی بو ور گیره * و هر کس که بیوی د گل اتو دعوا
٤١ بکا و کراست، بستینی جبّش بو وی بجی بیله * و هر کس که اتو
٤٢ مجبور د کا که یك فرسق بروی : دو د گل اوی برو * به وی که
له تو طلب د کا بده : و اوی که بیوی له تو قرض بستینی روی خوت
لی ورمگیره *

٤٣ بیستوتـانه کـه کتراوه : جیرانی خوت بحبینی و دژمنی خوت
٤٤ ببغضینی * بلّا امن به انگو دلّیم : دژمنانی خوتان بحبینن و بو اوانی
٤٥ که اذیتو ددن دعای خیر بکن * هتا کو ببنه مندالانی بابی خوتان که
ده آسمان دایه:چونکه تاوی خوی‌لسر خراپان و چاکان هلدینی و باران
٤٦ لسر حقان و ناحقان دبارینی * چونکه اگر انگو اوان بحبینن کـه
٤٧ انگو دحبینن : چی حقو هیه ؟ اری رادارانیش هر وا ناکن ؟ * و
اگر تنیـا برایانی خوتـان سلاوی بکن : چی زیـاتر د کن : اری
٤٨ بت پرستانیش هر وا ناکن ؟ * دنا انگو کامل بن چلونیکی بابی
آسمانی انگو کامله *

## باب ٦

١ بڵا هوشیار بن که صداقتی خوتان له بر چاوی خلکی نکن هتا کو
له وان ببیندرین : اگر نه : له بابی خوتان که ده آسمان دایه حقو نیه *
٢ دنا وختیکی صدقــه ددی لپیش خوت کرنا لی مــده چلونیکی
ریاکاران ده کنشتان و ده کوچاندا دکن هتــا کو له خلکی تعریف
٣ بکرین . راستی به انگو دڵیم : حقی خویان ور گرتوه * بڵا اتو وختیکی
٤ صدقه ددی با دستی چپی خوت نزانی دستی راستت چی دکا * هتا کو
صدقی تو ده دزیتی دا ببی : و بابی تو که ده دزیتی دا دبینی طوله به
تو ددا *
٥ و وختیکی نویژ دکن وکو ریاکاران مبن چونکه پییان خوشه که
ده کنشتان و ده کُلنچکانی کوچاندا راوستاو نویژ بکن هتا کو له
٦ خلکی دیار بین : راستی به انگو دڵیم : حقی خویان ور گرتوه * بڵا
اتو وختیــکی نویژ دکی وەژور خلوتی خوت بکوه و درکی خوت
پیوده و بو بابی خوت که ده دزیتی دایه نویژ بکه و بابی تو که ده
٧ دزیتی دا دبینی طوله به تو ددا * و وختیکی نویژ دکن زور قصانی
بطال مکن وکو بت پرستان : چونکه اوان فکر دکن که لبر کتنی
٨ زوری خویان قبول دکرین * دنا وکو اوان مبن : چونکه بابی انگو
٩ دزانی که چی احتیاجو هیه له پیش اوی که لی طلب دکن * دنا انگو
وها دعا بکن : یا بابی مه که ده آسمان دای نیوت مقــدس ببی *

١٠ پادشایتی تو بی : ارادت چلونیکی ده آسماندا لسر ارضیش ببی *
١١ :١٢ نانی مه ای هر روژ اورو به مه بده * و قرضی مه ببخشه چلونیکی
١٣ امش قرضدارانی خومـان دبخشین * و امی ده تجربیدا مبـه : بلّا
خلاصمان بکه له شری : چونکه ایتویه پادشایتی و قوت و خلال هتا
ابد الابد : امین *
١٤ چونکه اگر انگو به خلکی گناحانی وان ببخشن : بابی آسمانی
١٥ انگو انگوش دبخشی * بلّا اگر انگو به خلکی گناحانی وان نبخشن :
بابی انگو گناحانی انگوش نابخشی *
١٦ و وختیکی روژو دگرن رو گرژ مبن وکو ریا کاران : چونکه اوان
روی خویان دگورن هتاکو بو خلکی دیار ببن که به روژون . راستی
١٧ به انگو دلّیم : حقی خویان ورگرتوه * بلّا اتو وختیکی روژو دگری
١٨ سری خوت چور بکه و روی خوت بشو * هتاکو بو خلکی دیار نبی
که به روژوی : بلّا بو بابی خوت که ده دزیتی دایه : و بابی تو که
ده دزیتی دا دبینی طوله به تو ددا *
١٩ لسر ارضی خزینان بو خوتان خر مکن لکوی که مورانه و ژنگ
٢٠ خراپ دکن و لکوی که دزان کن دکن و ددزن * بلّا ده آسماندا
خزینان بو خوتان خر بکن لکوی کـه نه مورانه و نه ژنگ خراپ
٢١ دکن و لکوی که نه دزان کن دکن و نشدزن * چونکه لکوی که
خزینی تو یه دلّی توش لوی دبی *
٢٢ چرای بدن چاوه . دنا اگر چاوی تو صاغ بی : همو بدنی تو روناك

٢٣ دبی * بلّا اگر چاوی تو خراپ بی : همو بدنی تو تارك دبی . دنا اگر
روناکای که ده تو دایه تاریك ببی چند تاریکای گوره دبی *
٢٤ هیچکس ناتوانی خذمتی دو اغایان بکا : چونکه یان یکیکی
دبغضینی و اوی دیکه دحبینی : یان تابعی یکیکی دبی و اوی دیکه
٢٥ سوك دژمیری . انگو ناتوانن خذمتی خلّای و مامونای بکن * لبر اوی
به انگو دلّیم : خمی ژیانی خوتان مخون که چی بخون یان چی
بخونوه : و نه بو بدنی خوتان که چی دەبر بکن . اری ژیان له خوراك
٢٦ و بدن له جلّ زیاتر نیه ؟ * تماشای طیرانی آسمان بکن که نه دچینن
و نه دروینی دکن و نه ده امباراندا خر دکن : و بابی آسمانی انگو
٢٧ اوان بخیو دکا . اری انگو له وان زیاتر نین ؟ * و کیهه له انگو به
٢٨ خم خواردن دتوانی گزیك لسر بژنی خوی زیاد بکا ؟ * و لبر جلّ
بو چی خم دخون ؟ تماشای سویسنانی زویان بکن چلون گوره دبن .
٢٩ نه زحمت دکیشن و نه دریسن * بلّا به انگو دلّیم : سلیمانیش ده همو
٣٠ جلالی خویدا وکو یکیك له اوانی دەبر نکرابو * بلّا اگر خلّا گیای
دشتی که اورو هیه و صبحینی ده تندوری داویژری وها دەبر بکا :
٣١ اری زور زیاتر دەبر انگو ناکا ای کم ایمانان ؟ * دنا خمی مخون
٣٢ و بلّین : چی بخوین یان چی بخوینوه یان چی دەبر بکین ؟ * چونکه
بو همو او چتانه طایفان حول ددن : چونکه بابی آسمانی انگو دزانی
٣٣ که بو همو اوانه احتیاجیو هیه * بلّا هولی پادشایتی خلّای و صداقتی
٣٤ وی طلب بکن : و همو او چتانه بو انگو زیاد دبن * دنا خمی صبحینی

مخون : چونکــه صبحینی خمی خوی دخوا . هر روژ دردی خوی
بسیتی *

## باب ٧

١:٢ حکمی مکن هتاکو لسر انگو حکم نکری * چونکه به او حکمی
که انگو حکمی بکن لسرانگو حکم دکری : و به هر پیوانیکی که
٣ دپیون بو انگو دپیوری * و بو چی بوشکی ده چاوی برات دا دبینی
٤ بلا له کاریتی ده چاوی خوتدا اگات لی نیه ؟ * یان چلون به برات
دلی : لیم گری که پوشکی له چاوی تو درینم ؟ و اوتا ده چــاوی
٥ خوتدا کاریتیکی هیه * ای ریاکار : هولی او کاریتی له چاوی خوت
در ینه و او وختی چاك دبینی که پوشکی له چاوی برات در ینی *
٦ چتی مقدس به سگان مدن : و مرواریانی خوتــان لپیش برازان
ماویژن : نبا به پیانی خویان اوان بشیلن و ور گـَرین و انگو بدون *
٧ طلب بکن و به انگو ددری حول بدن و پیدا د کن : له در کی بدن
٨ و بو انگو د کریتوه * چونکه هر کس که طلب بکا ورد گری و اوی
٩ که حول بدا پیدا د کا و بو وی که له در کی بدا د کریتوه * یان کیهه
کس له انگو یه که اگر کوری وی نانی لی طلب بکا بردیکی به
١٠ وی ددا ؟ * یان اگر ماسییکی لی طلب بکا ماریکی به وی ددا ؟ *
١١ دنا اگر انگو که خراپن دزانن که دیاریانی چاك به مندالانی خوتان
بدن : چند زیاتر بابی انگو که ده آسمان دایه چتانی چاك ددا به اوانی

كه لی طلب بكن*
١٢ دنا هر چی كه دتانوی كه خلكی د گل انگو بكن : هر واش انگ
د گل اوان بكن : چونكه اویه شریعت و پیغمبران *
١٣ له در كی تنگ وەژور بكون : چونكه برینه او در كی و پانه او
ریی كه بو هلاكی دبا : و زورن اوانی كه به وی وەژور د كون *
١٤ چونكه تنگه او در كی و تسكه او ریی كه بو ژیانی دبا و كمن اوانی
كه اوی پیدا د كن *
١٥ هوشیار بن له پیغمبرانی دروزن كه به جلّی مران دینه كن انگو :
١٦ بلّا ده ژوریدا گرگانی درندن * له میوی وان انگـــو اوان دناسن .
١٧ اری له دروان تری یـــان له پوشكان هنجیران دچنن ؟ * هر واش
هر داریكی چاك میوی چاك دینی : بلّا داریكی خراپ میوی خراپ
١٨ دینی * داریكی چاك ناتوانی میوی خراپ بینی و نه داریكی خراپ
١٩ میوی چاك بینی * هر داریكی كه میوی چـــاك ناینی دبردری و ده
٢٠:٢١ آوری داویژری * دنا له میوی وان انگو اوان دناسن * نه هر كس
كه به من بلّی : یا رب : یا رب : وەژور پادشایتی آسمان د كوی : بلّا
٢٢ اوی كه ارادی بابی من كه ده آسمان دایه بجی بینی * زوران داو
روژیـــدا بـــه من دلّین : یـــا رب : یـــا رب : اری به نیـــوی تو
پیغمبریتیمان نكردوه : و به نیوی تو جنّانمان در نكردوه : و به نیوی
٢٣ تو زور قوتانمان نكردوه ؟ * و او وختی به وان خبر ددم : قط انگوم
نناسیوه : له من ذور بن : ای انگو بی شرعیكران *

٢٤ دنا هر کس که او قصانی من ببیی و اوانی بجی بینی به پیاویکی
٢٥ عاقل دشبهیندری که مالی خوی لسر شاخی درست کرد * و باران
باری و سیلاوان هاتن و بایان لیدان و لو مالییان خست : و نروخا
٢٦ چونکه لسر شاخی داندرا بو * و هر کس که او قصانی من ببیی و
اوانی بجی نینی به پیاویکی نغام دشبهیندری که مالی خوی لسر
٢٧ خیزی درست کرد * و باران باری و سیلاوان هاتن و بایان لیدان و لو
مالییان خست و روخا و روخاندنی وی گوره بو *
٢٨ و بو که وختیکی یسوع او قصانی خلاص کردبو جماعتان له
٢٩ تعلیمی وی مات بون * چونکه اوانی تعلیم ددا وکو کسیکی که
حکماتی بی و نه وکو خویندوارانی وان *

## باب ٨

١ و وختیکی او له کیوی هاته خواری : جماعتانی زور وەدوای وی
٢ کوتن * و اوتا گولیك هات و سجدی لی کرد دیگت : یا رب : اگر
٣ بتوی دتوانی امن پاك بکیوه * و دستی دریژ کرد : دستی له وی دا
٤ دیگت : دموی : پاك بوه . و جی بجی گولیتی وی پاك بووه * و یسوع
به وی گت : هوشیار به : به هیچکس ملّی : بلّا برو خوت به کاهن
نیشان بده و او قربانی بره که موسی امری کردوه بو شایدی له سر
اوان *
٥ و که وەژور کفرناحومی کوت یوزباشییك هاته کن اوی : لی

٦ پاراوه * و دیگت : یا رب خذمتکاری من ده مالیدا افلیج کوتوه و
٧ اذیتی زور د کیشی * او به وی گت : امن دیم و اوی صاغ د کموه *
٨ بلا یوزباشی جوابی دا و گتی : یا رب امن لایق نیم که اتو لبن میچی
من وه‌ژور بکوی : بلا تاقه قصیکی بلی و خذمتکاری من صاغ دبیتوه *
٩ چونله امنیش پیاویکم لبن حکمات و عسکران به دستی خومم هیه
و به یکیك دلیم برو و دروا:و به یکی دیکه وره و دی و به عبدی خوم
١٠ اوی بکه و دیکا * بلا وختیکی یسوع اوی بیست عجایب ما و به اوانی
که وه‌دوای وی د کوتن کتی : راستی به انگو دلیم : ده اسرائیلدا
١١ لکن هیچکس باوریکی وها گورم پیدا نکردوه * و به انگو دلیم :
که زوران له روژ هلاتی و روژ آوای دین و لسر سفری د گل
١٢ ابراهیم و اسحق و یعقوب ده پادشایتی آسماندا رودنیشن * بلا
مندالانی پادشایتی فری ددرینه تاریکای دری : لوی گریان و
١٣ چیراندنی ددانان دبی * و یسوع به یوزباشی گت : برو : چلونیکی
باورت کردوه وها بو تو ببی . و هر داو ساعتیدا خذمتکاری وی صاغ
بووه *
١٤ و که یسوع هاته مالی پطروس : خسوی وی دی کوتو و
١٥ نوبتیدار * و دستی له دستی وی دا و نوبتی بری دا و هلستا و خذمتی
١٦ وی دکرد * بلا وختیکی ایواری بو زور جندارانیان هینا کن اوی
١٧ و روحانی به قصه در د کرد و همو نخوشانی صاغ کردوه * هتا کو تواو
ببی او چتی که کتراوه به دستی اشعیا پیغمبر که دلی : دردانی مـی

لسر خوی قبول کرد و نخوشیانی مـی هلگرت *
۱۸ بلا وختیکی یسوع غلبایکی دوری خوی دی امری کرد کـه
۱۹ بپرنوه او بری * و خویندواریـك هـاته پیشی و به وی گت : ای
۲۰ ماموستا : هر جییکی کـه بچي وه‌دوای تو د کوم * و یسوع به وی
گت : ریویان کونانیان هیه و طیرانی آسمان هیلانان : بلا کوری
۲۱ انسانی جي نیه که سری لی دابنی * و یکی دیکه له شاگردانی وی
۲۲ به وی گت : یا رب اذنم بده که هولی بچم و بابی خوم بنیژم * بلا
یسوع به وی گت : وه‌دوای من بکوه و له مردوان گری که مردوانی
خویان بنیژن *
۲۳:۲٤ و که سواری گمی بو شاگردانی وی وه‌دوای کوتن * و اوتـا
گیژیکی گوره ده بحریدا بو وها که گمی له شپولان دادپوشرا : بلا
۲۵ او نوستبو * و هاتنه پیشی و اویان وه‌خبر هینا دیان گت : یـا رب
۲٦ خلاص بکه : هلاك دبین * و او به وانی گت : بو چی ترسه‌نو کن
ای کم ایمانان ؟ او دمی هلستا و هرشی له بایـان و بحری کرد و
۲۷ آرامیکی گوره بو * بلا خلکی عجایب مان و دیان گت : اوه چی
جور پیاویکه که بایان و بحریش اطاعتی وی د کن ؟ *
۲۸ و که هاته او بری بو ولاتی جدریان : دو جنداران توشی وی بون
که له قبران دهاتن : زور هار وها که هیچکس نیـدتوانی باو رین
۲۹ دابری * و اوتا قیژاندیان دیان گت : چمان د گل تو هیه ای کوری
۳۰ خلای ؟ اری هاتویه ایره که له پیش وخت عـاذابمان بدی ؟ * بلا

٣١ دور له وان گارانیکی زوری برازان له لوری بو * و او جنّانه لـی
پارانوه دیان گت : اگر امـَی در بکی بمان نیره نیو گارانی برازان *
٣٢ و به وانی گت : برون . و اوان وه‌در کوتن و چونه نیو برازان . و
اوتا همو گارانکه خویان له سربره‌ژوری هلداشته بحری و ده آویدا
٣٣ مردن * بلّا برازوانان هلاتن و چونه نیو شاری و همو چتی خبریان دا
٣٤ و چی لو جنـّدارانه قومابو * و اوتا همو شاری به پیروی یسوع وه‌در
کوتن و که اویا ن دی لی پارانوه که له سرحدانی وان بروا *

## باب ٩

٢:١ و سواری گمی بو و پریوه و هاته شاری خوی * و اوتا افلیجیکیان
هینا کن اوی لسر دوشگیکی راکشاو : و که یسوع باوری وانی دی
٣ باو افلیجی گت : روله خاطرجم به گناحانی تو بخشراون * و اوتا
٤ هیندیك له خویندواران ده خویان دا کتیان:اوه کفر دلّی * و که یسوع
خیالانی وانی زانی کتی : بو چی ده دلّی خوتـاندا فکری خراپ
٥ د کن ؟ * چونکه کیهه هاسانتره که بلّی : گناحانی تو بخشراون یان
٦ که بلّی هلسته و بگری ؟ * بلّا هتا کو انگو بزانن که کوری انسانی
حکماتی هیه لسر ارضی که گناحـان ببخشی : او دمی باو افلیجی
٧ گت : هلسته دوشکی خوت هلگره و برو مالی خوت * و هلستا و
٨ چو مالی خوی * بلّا وختیکی جماعتان اویان دی ترسـان و شکری
خلّایان کرد که او جور حکماتی به انسان داوه *

٩ و که یسوع له اوی رادبرد پیاویکی نیوی متّی دی که ده گمر گیدا
رونیشتبو و به وی گت : وه‌دوای من بکوه : و هلستا و وه‌دوای وی
١٠ کوت * و بو که وختیکی ده مالیدا لسر سفری رونیشتبو : اوتا راداران
و گناحکارانی زور هاتن و لسر سفری د گل یسوع و شاگردانی وی
١١ رودنیشتن * و که فریسیان اویان دی به شاگردانی وییان گت : لبر
١٢ چی ماموستای انگو د گل راداران و گناحکاران دخوا ؟ * بلّا وختیکی
١٣ اوی بیست کتی : صاغان احتیاجی حکیمیان نیه : بلّا نخوشان * بلّا
برون و فیر بن اوه چیه : رحمم دوی و نه قربان : چونکه نهاتوم که
صادقان بانگ بکم بلّا گناحکاران *
١٤ او دمی شاگردانی یوحنّا هاتنه کن اوی دیان گت : لبر چی امه
١٥ و فریسیان روژو دگرین : بلّا شاگردانی تو روژو ناگرن؟ * و یسوع
به وانی گت : اری دتوانن خلکی داوتی شینی بکن که هیشتا زاوا
دگل اوانه ؟ بلّا روژان دین وختیکی زاوا له وان دستیندری و او
١٦ وختی به روژو دبن * و هیچکس پرویکی پارچی تازه له جلّیـــکی
١٧ کون نادا : چونکه او پینه له جلّی دیتوه و دراو که خراپتر دبی * و
شراپی تازش ده مَـشکانی کون تی ناکن : اگرنه مَـشکان دقلشین
و شراپ درژی و مَـشکان خراپ دبن . بلّا شراپی تازه ده مَـشکانی
تازه تی دکن وَ هر دو کیان راد گیرین *
١٨ که او هیشتا او چتانی به وان قصه دکرد : اوتا مزنیك هــات و
سجدی لی کرد دیگت : کچم هر اویستا مردوه : بلّا وره و دستی

۱۹ خوت لسر اوی دابنی و دژیتوه * و یسوع هلستا و وەدوای وی کوت
۲۰ و شاگردانی ویش * و اوتا ژنیکی که مدی دوازده سالان خوین له
۲۱ بر چونی هبو له پشتوه هات و دستی له داوینی جلّی وی دا * چونکه
۲۲ ده خویدا کتی : اگر تینا دست له جلّی وی بدم صاغ دبموه * بلّا یسوع
ورگرا و که اوی دی کتی : ای کچ خاطرجم به ایمـانی تو اتوی
۲۳ خلاص کردوه . و هر له او ساعتیوه ژنکه صاغ بووه * و که یسوع هاته
۲٤ ژور مالی او مزنی و زورناچیان و گابوریکی دی * کتی : لا بچن
۲٥ چونکه کچکه نمردوه بلّا نوستوه . و پی پیکنین * بلّا وختیکی غلبای
۲٦ در کرابون چو ژوری و دستی وی گرت و کچکه هلستا *
۲٦:۲۷ و خبری اوی ده همو او ولاتیدا وەدر کوت * و که یسوع له اوی
رادبرد : دو کویران وەدوای وی د کوتن دیان‌قیژاند و دیان گت :
۲۸ ای کوری داود رحمی به مه بکه * و که هاته مالی : او کویرانه هاتنه
کن اوی : و یسوع به وانی گت : اری باور د کن که امن دتوانم
۲۹ اوی بکم ؟ به وییان گت : بلی ای رب * او وختی دستی له چاوانی
۳۰ وان دا دیگت : و کو باورو وها بو انگو ببی * و چاوانی وان کرانوه :
و یسوع به قایمی به وانی اسپارد دیگت : هوشیار بن کـه هیچکس
۳۱ نزانی * بلّا اوان وەدر کوتن و خبری وییان ده همو او ولاتیدا بلاو
د کردوه *
۳۲ بلّا وختیکی اوان دچونه دری : اوتا لالیکی جنّداریان هینا کن
۳۳ اوی * و که جنّکه در کرابو او لالّکه قصی کرد و خلکی عجایب مان

۳٤ دیان گت : چتیکی وها ده اسرائیلدا قط نبینـدراوه * بلّا فریسیان
۳٥ کتیان : به مزنی جنّان جنّان در د کا * و یسوع همو شاران و دییانی
دگـَرا و ده کنشتانی واندا تعلیمی ددا و انجیلی پادشایتی وعظ دکرد
۳٦ و همو نخوشی و همو دردی صاغ دکردوه * بلّا وختیکی او جماعتانی
دی رحمی به وان داهات : چونکه اذیت دراو و بلاو بون و کو مران
۳۷ که شوانیان نبی * او دمی به شاگردانی خوی گت : دروینه زوره بلّا
۳۸ فعلان کمن * دنا له صاحبی دروینی طلب بکن که فعلان بو دروینی
خوی در بکا *

## باب ۱۰

۱ و او داوزده شاگردانی خوي بانگ کرد و حکماتی لسر روحانی
پیس به وان دا هتا کو اوان در بکن و که همو نخوشیتی و همو درد
۲ صاغ بکنوه * و نیوانی او دوازده رسولانه اوانن : هول شمعون که
پطروس بانگ دکری و برای وی اندریـّاس و یعقوب کوری زبدی
۳ و برای وی یوحنـّا * فیلپوس و برتولمای : توما و متـّی رادار : یعقوب
٤ کوری حلفی وتدی * شمعون قانوی و یهودای اسخریوطی که اوی
٥ تسلیم کرد * یسوع او دوازدانی نارد و به وانی اسپارد دیگت : به
٦ ریی بت‌پرستان مچن و وه‌ژور شاری سماریان مکون * بلّا زیاتر بچنه
۷ کن مرانی ون بوانی مالی اسرائیل * و وختیکی دچن وعظ بکن و
۸ بلّین : پادشایتی آسمان نیزیك بوه * نخوشان صاغ بکنـوه : مردوان

هلبستیننوه : گولان پاك بكنـوه وجنّان در بكن . به خورای ورتان
٩ گرتوه : به خورای بدن * زیو یان زیر یان مس ده پشتیندی خوتاندا
١٠ هلمگرن * و نه توربین بو ریی و نه دو كراسان و نه كوشان و نه عصا
١١ چونكه فعله لایقی خواردنی خویـتی * و ده هر شاریكیدا یان دیی كه
وەژور د كون پرسیار بكن كی لایقه ده ویدا و لوی بمینن هتا له اوی
١٢ وەدر د كون * و كـه وەژور مـالیكی د كون به وی سلاو بكن *
١٣ و اگر او ماله لایق بی : با سلاوی انگو لسر اوی بی : بلّا اگر لایق
١٤ نبی : با سلاوی انگو بو انگو بگـَریتوه * و هر كس كه انگو قبول
نكا و گوی له قصانی انگو نگری : وختیكی لو مالی یان لو شاری
١٥ دینه دری توزی له پیانی خوتان بتكینن * راستی به انگو دلّیم : كه
ده روژی دیواندا بو ولاتی سدوم و عموره هاسانتر دبی له بو او شاره *
١٦ اوتا امن انگو دنیرم وكو مران لنیو گرگان : دنا عاقل بن وكو
١٧ ماران و فقیر وكو كوتران * بلّا له خلكی هوشیار بن : چونكه انگو
به مجلیسانی كخدایان تسلیم دكن : و انگو ده كنشتانی خویاندا قامچی
١٨ لی ددن * و لپیش حاكمان وپادشایان دبردرین لبر خاطری من : بو
١٩ شایدی له سر اوان و له سر بت‌پرستان * بلّا وختیكی اوان انگو تسلیم
دكن : خمی مخون چلون یان چی قصان بكن : چونكه هر داو سعاتیدا
٢٠ به انگو ددری چی قصان بكن * چونكه انگو نین كه قصان دكن :
٢١ بلّا روحی بابی انگو كه ده انگودا قصان دكا * و برا برای بو مردن
تسلیم دكا و باب مندالی : و اولاد لسر والـدین هلـدستن و اوان

٢٢ د کوژن * و انگو له همو خلکی دبغضیندرین لبر نیوی من : بلّا اوی
٢٣ که هتا آخری صبری بکا او خلاص دبی * بلّا وختیکی به انگو ده
شاریکیدا اذیت ددن هلین بو اوی دیکه : چونکه راستی به انگو دلّیم :
شارانی اسرائیل خلاص ناکن هتا کوری انسانی دی *
٢٤ شاگرد له ماموستای زیاتر نیه و نه خذمتکار زیاتر له اغای خوی *
٢٥ بو شاگرد بسه که وکو ماموستای خوی ببی و خذمتکار وکو اغای
خوی . اگر صاحب مالی بعلزبولیان بانگ کردوه : چند زیاتر اهلی
٢٦ مالی وی * دنا له وان مترسن : چونکه هیچ چتیکی شاردراو نیه که
٢٧ اشکرا نبی و نه چتیك به دزی که نناسری * اوی که ده تاریکایدا به
انگو دلّیم ده روناکایدا بیلّین : و اوی که ده گویدا دیین لسر بانان
٢٨ وعظ بکن * و مترسین له اوای که بدن دکوژن : بلّا گیان ناتوانن
بکوژن : بلّا زیاتر له وی بترسین که دتوانی گیان و بدنیش ده
٢٩ جهنمیدا هلاك بکا * اری دو چویلکان به پولیکی نافروشرین ؟ و
٣٠ یکیك له وان به بی اذنی بابی انگو له ارضی نکوی * بلّا مویانی سری
٣١ انگوش همو بژاردراون * دنا مترسین: انگو له زور چویلکان زیاترن *
٣٢ دنا هر کس که امن لپیش خلکی اقرار بکا امنیش اوی اقرار دکم
٣٣ لپیش بابی من که ده آسمان دایه * بلّا هر کس که لکن خلکی له
من حاشا بکا امنیش له وی حاشا دکم لکن بابی من که ده آسمان
دایه *
٣٤ فکر مکن که هاتوم که صُلح لسر ارضی دابنیم . ناهانوم که صلح

٣٥ دابنیم بلّا شیر * چونکه هاتوم که کس له بابی خوی و کچ له دایکی
٣٦ خوی و بوكِ له خسوی خوی جوی بکم * و اهلی مالی خوی دژمنانی
٣٧ کس دبن * اوی که باب یان دایك له من زیاتر خوش بوی لایقی
من نیه : و اوی که کور یان کچ له من زیاتر خوش بوی لایقی من
٣٨ نیه * و اوی که سیداری خوی هلنگری و وەدوای من نکوی لایقی
٣٩ من نیه * اوی که گیانی خوی پیدا بکا ونی دکا : و اوی که گیانی
٤٠ خوی لبر خاطری من ون بکا پیدای دکا * اوی که انگو قبول بکا :
امن قبول دکا و اوی که امن قبول بکا اوی قبول دکا که امنی ناردوه *
٤١ اوی که پیغمبریکی به نیوی پیغمبر قبول بکا : حقی پیغمبری ورد گری:
و اوی که صادقیکی به نیوی صادق قبول بکا : حقی صادقی ورد گری*
٤٢ و هر کس که به یکیکی لو چکولانه تنیا جامیکی آوی سارد به نیوی
شاگرد بدا که بخواتوه : راستی به انگو دلّیم : حقی وی قط ون نابی *

## باب ١١

١ و بو که وختیکی یسوع له حکم دانی او دوازده شاگردانی خوی
خلاص بو : له اوی چو که تعلیم بدا و وعظ بکا ده شارانی واندا *
٢ بلّا وختیکی یوحنّا ده بندیخانیدا له عملانی مسیحی بیست به دستی
٣ شاگردانی خوی نارد * و به وی گت : اری اتوی اوی که دی یان
٤ چاوەنوری یکی دیکه ببین ؟ * یسوع جوابی دا و به وانی گت : برون
٥ و به یوحنّا خبر بدن له او چتانێ که دبین و دبینن * کویران دبینن

و شلان دگرین : گولان پاك دكرینــوه و كرلن دبین : مردوان
٦ هلدستیندرین و به فقیران مزگینی ددری * و خوزگه به هر كسیكی
كه له من هلنا نگویندری *
۷ و كه اوان روین یسوع دستی پی كرد كه به جماعتان بحثی یوحنّا
بلّی : انگو بو تماشا كردنی چی ده چولیــدا وەدر كــوتن ؟ اری
۸ قامیشیكی كه به بای دبزوتری ؟ * بلّا بو دیتنی چی وەدر كوتن ؟
اری پیاویك ده جلّی نازك دەبر كراو ؟ اوتا اوانی كه جلّی نازك دەبر
۹ دكن ده مالانی پادشایانن * بلّا بو چی وەدر كوتن ؟ اری كــه
۱۰ پیغمبریك ببینن ؟ بلی : به انگو دلّیم : زیاتریش له پیغمبر * اویه كه
بحثی وی نوسراوه : اونا امن دنیرمه پیش روی تو ملایكتی خوم
۱۱ اوی كه ریك دخا ریی تو پیشی تو * راستی به انــگو دلّیم : لنیو
اولادانی ژنان گورەتریكی له یوحنّا تعمیددر هلنسەوه بلّا او چكولەتر
۱۲ ده پادشایتی آسماندا له وی گورەتره * و له روژانی یوحنّا تعمیددر
هتا ئویسنا پادشایتی آسمان زوری دكری و زور كران اوی درفینن *
۱۳ چونكه همو پیغمبران و شریعت هتا یوحنّــا پیغمبریتییــان كرد *
۱٤:۱٥ و اگر بتانوی قبول بكن اویه الیاس اوی كه دبا بی * اوی كه
۱٦ گوی هیه با ببیی * بلّا او سلسلی به چی بشبهینم ؟ دشبهین به مندالّان
۱۷ كه ده میدانا ندا رودنیشن و بو اوانی دیكه بانگ دكن * و دلّین : بو
۱۸ انگو زورنامان لیدا و هلنپرین : شینمان كرد و له سنگو ندا * چونكه
۱۹ یوحنّا هات : نه دخوا و نه دخواتوه و دلّین : جنّی هیه * كوری انسانی

هات دخوا و دخواتوه و دلّین : اوتا پیاویکی زور خور و شراپ خور :
دوستی راداران و گناحکاران : و عقلداری له عملانی خوی تصدیق
کرا *
۲۰ او وختی دستی پی کرد که لو شارانه لومه بکا که بشی گوری
۲۱ قوتانی وی ده واندا کرابون : چونکه توبه‌یان نکردبو * وای بو تو
ای خورزین : وای بو تو ای بیت صیدا : چونکه اگر او قوتانی که ده
انگودا کراون : ده صور و صیدوندا کرابان : له میژ بو ده پلاس و
۲۲ خولامیش توبه‌یان دکرد * بلّا به انگو دلّیم : که ده روژی دیواندا
۲۳ هاساتر دبی بو صور و صیدون له بو انگو * و اتو ای کفرناحوم مگر
هتا آسمان بلند دکري ? هتا جهنمی دخریه خواری : چونکه اگر او
۲٤ قوتانی که ده تودا کراون ده سدوم کرابان : هتا اورو دما * بلّا به
انگو دلّیم : که ده روژی دیواندا هاساتر دبی بو ولاتی سدوم له بو
انگو *
۲۵ داو وختیدا یسوع جوابی دا و کتی : شکری تو دکم یا بابه : صاحبی
ارض و آسمان : که اوانت له عاقلان و زانان شاردوتوه و اوانت بو
۲٦ مندالان اشکرا کردوه * بلی یا بابه : چونکه لپیشی تو وها خوش بو *
۲۷ همو چت به من له بابم اسپاردراوه و هیچکس کور ناناسی بجگه له
باب : و هیچکس بابیش ناناسی بجگه له کور و اوی که کور بیوی
۲۸ بو وی اشکرای بکا * ورنه کن امن ای همو زحمت کیشان و گرانباران
۲۹ و امن به انگو رحتی ددم * نیری من لسر خوتان هلگرن و له من فیر

بن : چونکه امن صبردارم و ده دڵدا حلیمم : و بو گیانی خوتان رحتی
۳۰ پیدا دکن * چونکه نیری من خوشه و باری من سوکه *

باب ۱۲

۱ داو وختیدا یسوع ده روژی شمویدا به نیو زویـان دا رادبرد و
شاگردانی وی برسی بون و دستیان پی کرد که گُل بچنن و که بیخون*
۲ بڵا وختیکی فریسیان اویان دی به وییان گت : اوتـا شاگردانی تو
۳ اوی دکن که کردنی وی ده شمویدا درست نیــه * بڵا او به وانی
گت : اری نتان‌خویندوه داود چی کرد وختیکی برسی بو و اوانی
٤ که دگل اوی بون ؟ * چلون وه‌ژور مــالی خــڵای کوت و نانی
رابواردني خوارد : اوی که بو وی حلال نبو که بخوا : و نه بو اوانی
٥ که دگل اوی بون : مگر تنیا بو کاهنان * یان اری ده شریعتدا نتان
خویندوه که ده شمویاندا کاهنان ده هیکلیــدا شموی دشکینن و بی
٦ گناحن ؟ * بڵا به انگو دڵیم : که لیره گوره‌تریك له هیکلی هیه *
۷ بڵا اگر بتان‌زانیبایه اوه چیه : روحمم دوی و نه قربان : بی گناحانو
۸ گناحکار ندکرد * چونکه کوری انسانی ربّی شمویه *
۹:۱۰ و له اوی وه‌در کوت و چو نیو کنشتی وان * و اوتا پیلویك هبو
که دستیکی وشکی بو : و له وییان پرسی دیان گت : اری ده شمویاندا
۱۱ صاغ کردنوی درسته ؟ هتاکو گلیی لی بکن * بڵا او به وانی گت :
کیهه کس له انگو که مریکی هبی و اگر ده شموی ده چالیکیدا بکوی

۱۲ اری اوی ناگری و دری ناکیشی ؟ * دنا انسان له مر چند زیاتره .
۱۳ که وایه ده شمویدا چاکه کردن درسته * او وختی باو پیاوی گت :
دستی خوت دریژ بکه . و دریژی کرد : و صاغ بووه و کو اوی دیکه *
۱٤ بلّا فریسیان وەدر کوتن و ضدی وی تگبیریان کرد که چلون اوی
۱٥ هلاك بکن * بلّا که یسوع اوی زانی خوی له اوی وەلا کیشا و زوران
۱٦ وەدوای وی کوتن و همویانی صاغ کردوه * و به قایمی به وانی اسپارد
۱۷ که اوی اشکرا نکن * هتاکو تواو ببی او چتی که کتراوه به دستی
۱۸ اشعیا پیغمبر که دلّی * اوتا عبدی من که هلمبژاردوه : او خوشوستی
من که گیانم لي خوشحاله . روحی خوم لسر اوی دادنیم و حکمی
۱۹ بو طایفان خبر ددا * او شری ناکا و نه دقیژینی و کسیك دنگی وی
۲۰ ده کوچاندا نابیی * قامیشی کوشراو ناشکینی و پلیتی دوکالـــکر
۲۱ ناکوژینیتوه : هتا حکمی بو غالبی درنینی * و به نیوی وی طایفان
هومید دکن *
۲۲ او وختی جنّداریکیان هینا کن اوی که کویر و لالّ بو : و اوی
۲۳ صاغ کردوه وها که او لالّکه قصی کرد و دیتی * و همو خلکی مات
۲٤ مان و کتیان : اری اوه کوری داود نیه ؟ * بلّا وختیکی فریسیـــان
بیستیان کتیان : او پیاوه جنّان در ناکا مگر به بعلزبول مزنی جنّان *
۲٥ و که خیالانی وانی زانی به وانی گت : هر پادشایتیکی که ضدی
خوی جوی ببی خراپ دبی و هر شار یان مالیکی که ضدی خوی جوی
۲٦ ببی راناوستی * و اگر شیطان شیطانی در بکا ضدی خوی جوی بوه :

۲۷ دنا پادشایتی وی چلون رادوستی ؟ * و اگر امن جنّان به بعلزبول در
دکم کورانی انگو به کی اوان در دکن ؟ لبر اوی اوان حکمکرانی
۲۸ انگو دبن * بلّا اگر امن جنّان به روحی خلّای در دکم : که وایه
۲۹ پادشایتی خلّای لسر انگو گیشتوه * یان چلون دتوانی کسیك وەژور
مالی صاحب قوتی بکوی و اسبابانی وی تالان بکا : مگر هولی او
۳۰ صاحب قوتی ببستی و او وختی مالی وی تالان بکا * اوی که دگل
۳۱ امن نیه ضدی منه : و اوی که دگل امن خر ناکا بلاو دکا * لبر اوی
به انگو دلّیم : هر گناح و کفر به بنی آدمی دبخشری بلّا کفر ضدی
۳۲ روح القدوس نابخشری * و هر کس که قصیکی ضدی کوری انسانی
بلّی به وی دبخشری : بلّا هر کس که ضدی روح القدوس قصان
۳۳ بکا به وی نابخشری : نه داو دنیایدا و نه ده اوی که دی * یان دار که
چاك بکن و میوی وی چاك : یان دار که خراپ بکن و میـوی وی
۳٤ خراپ : چونکه دار له میوی دناسری * ای اولادی ماران : چلون
دتوانن چتانی چاك قصان بکن که خراپن ؟ چونکه له زیادی دلّ زار
۳۵ قصان دکا * پیاویکی چاك له خزینی چاك چتانی چاك در دینی : و
۳٦ پیاویکی خراپ له خزینی خراپ چتانی خراپ در دینی * بلا به انگو
دلّیم : که هر قصیکی بطال که خلکی قصان بکن : ده روژی دیواندا
۳۷ دبی حسابی وی بدن * چونکه له قصانی خوت صادق دژمیردري و له
قصانی خوت حکم لسرت دکری *

۳۸ او وختی هیندیك له خویندواران و فریسیان جوابیان به وی دا دیان

۳۹ گت : ای ماموستا : دمانوی که نیشانیکی له تو ببینین * بلّا او جوابی
دا و به وانی گت : سلسلیکی خراپ و زناحکار نیشانَی طلب دکا و
۴۰ نیشانیك به وی نادری بجگــه له نیشانـَی یونس پیغمبر * چونکــه
چلونیکی یونس سَــی روژ و سَی شو ده زگی ماسیــدا بو : هر واش
۴۱ کوری انسانی سَی روژ سَی شو ده باوشی ارضیدا دبی * پیــاوانی
نینوی ده دیواندا دگل او سلسلی هلدستن و حکمی لسر اوی دکن :
چونکه به وعظی یونس توبه‌یان کرد : و اوتا لیره زیاتر له یونس هیه *
۴۲ ملکـَی جنوبی ده دیواندا دگل او سلسلی هلدستی و حکمی لسر اوی
دکا : چونکه او له پرانی ارضی هات که عقلداری سلیمان ببیی : و
اوتا لیره زیاتر له سلیمان هیه *
۴۳ وختیکی روحی پیس له انسانیکی وه‌در کوتوه : ده جیانی بی آو
۴۴ دگـَری و حولی رحتی ددا و پیدا ناکا * او وختی دلّی : دگـَریموه بو
مالی خوم که لی وه‌در کوتوم : و که دیتوه اوی بطال و مالدُراو و
۴۵ جوانکراو پیدا دکا * او وختی دچی و حوت روحانی دیکه خراپتر له
خوی دگل خوی هلدگری و وه‌ژور دکون و لوی دمینن : و آخری
او انسانی له هولی خراپتر دبی . هر واش دبی بو او سلسلی خراپ *
۴۶ که هیشتا دگل جماعتان قصی دکرد اوتا دایك و برایانی وی له
۴۷ دری راوستا بون و دیانویست که دگل اوی قصان بکن * و کسیك
به وی گت : اوتا دایك و برایانت له دری راوستاون و دیانوی که
۴۸ دگل اتو قصان بکن * بلّا او جوابی دا و به وی که اوی پی گت کتی:

٤٩ کییه دایکی من و کین برایانی من ؟ * و دستی بو لای شاگردانی
٥٠ خوی دریژ کرد و کتی : اوتا دایك و برایانی من * چونکه هر کس
که ارادی بابی من که ده آسمان دایه بجی بینی : اوه برا و خوشك و
دایکی من *

## باب ١٣

١ داو روژیدا یسوع له مالی وەدر کوت و لکن بحری رونیشت *
٢ و خلکیکی زور لکن اوی خر بونوه وها که او وەژور گمییکی کوت
٣ و رونیشت : و همو خلککه له قراغی راوستان * و چتانی زور بـه
مثلان د گل اوان قصی کرد دیگت : اوتا توچین وەدر کوت که توی
٤ بچینی * و که دچاند : هیندیك کوته سر ریی و طیران هاتن و اویان
٥ خوارد * و هیندیك کوته سر جیانی برداوی لکوی که گلی زوری
٦ نبو : و زو روا چونکه ارضی قولی نبو * و که روژ هلات سوتاندی .
٧ و چونکه رگی نبو وشك بو * و هیندیك کوته نیو دروان : و دروان
٨ هلچون و اویان خنکاند * بلّا هیندیك کوته سر ارضی چاك و بری
هینا هیندیك یك و صد و هیندیك یك و شیصت و هیندیك یك و سی *
٩ اوی که گوی هیه با ببیی *
١٠ و شاگردان هاتن و به وییان گت : لبر چی به مثلان د گل اوان
١١ قصان د کی ؟ بلّا او جوابی دا و کتی : چونکه به انگو دراوه کـه
١٢ سرانی پادشایتی آسمان بزانن : بلّا به وان ندراوه * چونکه هر کس

که هیتی : به وی ددری و زیاد د کری : بلّا هر کس که نیتی اوی
۱۳ که هشیتی لي دستیندری * لبر اوی د گل اوان به مثلان قصان د کم :
۱٤ چونکه دبینن و نابینن : و دبین و نابین و نافامن * و لسر اوان تواو
دبی او پیغمبریتی اشعیا که دلّی : به بیستنی انگو دبین و قط نلفامن
۱٥ و به دیتنی دبینن و قط ناناسن * چونکه دلّی او قومی غلیظ بوه و به
گویان به گرانی دبین : و چاوانی خویان قوچاندوه : نبا به چاوان ببینن
و به گویان ببین و به دلّ بغامن و ور گـرین و امن به وان نجات بدم *
۱٦ بلّا خوز که به چاوانی انگو چونکه دبینن و گویانی انگو چونکه دبین *
۱۷ چونکه راستی به انگو دلّیم : زور پیغمبران و صادقان حسرتیان کیشاوه
که ببینن او چتانی که انگو دبینن و نیان‌دیوه و که ببین او چتـــانی
که انگو دبین و نیان بیستوه *
۱۸:۱۹ دنا انگو مثلی توچینی ببین * هر وختیکی کسیك کلامی پادشایتی
دبیی و نایغامی شری دی و اوی که ده دلّی ویدا چیندراوه درفینی .
۲۰ اویه اوی که لسر ریی چیندرا * و اوی که لسر جیانی برداوی چیندرا
۲۱ اویه که کلامی دبیی و جی بچی به خوشی اوی قبول د کا * امّا هیچ
رگ ده خویدا نیه و دمیکی دمینی : بلّا وختیکی تنگانی یان اذیت
لبر او کلامی پیدا دبی : جی بجی هلدنگوی * و اوی که لنیو دروان
چیندرا اویه که کلامی دبیی و خمی او دنیایی و فریوی مال کلامی
۲۳ دخنکینن و بی بر دبی * بلّا اوی که لسر ارضی چاك چیندرا اویه که
کلامی دبیی و دیغامی و بریش دینی : هیندیك یك و صد و هیندیك

یک و شیصت و هیندیك یك و سی د کا *
٢٤ مثلیکیِ دیکی بو وان داهینا دیگت : پادشایتی آسمان دشبهی
٢٥ به پیاویکی که توی چاکی ده زویی خویدا چاند * بلّا وختیکی خلکی
ده خودا بوِن دژمنی وی هات و گُرگـَی لنیو گنمی چاند و روی *
٢٦ بلّا وختیکی گیای روا و گُلّی کرد او وختی گُرگـَش دیار بون *
٢٧ و خذمتکارانی صاحب مالی هاتن و به ویان گت : ای اغا اری ده
زویی خوتدا توی چاکت نچاندوه ؟ دنا له کوی گُرگـَی هیه ؟ *
٢٨ او به وانی گت : پیاویکی دژمن اوی کردوه . و خذمتکاران به ویان
٢٩ گت : دنا دتوی که بچین و اوانه خر بکینـَوه ؟ * بلّا او کتی : نه
خیر : نبا وختیکی گُرگـَی خر دکنـَوه گنمکش دگل اوان هلبکنن*
٣٠ له هر دو کیان گرین که پیکوه گوره بِن هتا دروینی : و ده وختی
دروینیدا به دروینکران دلّیم : هولی گُرگـَی خر بکنـَوه و اوان به
باقه ببستن بو سوتاندنی : بلّا گنمی ده اماری مندا خر بکنـَوه *
٣١ مثلیکی دیکی بو وان داهینا دیگت : پادشایتی آسمان دشبهی به
٣٢ دنکیکی خردل که پیاویك گرتی و ده زویی خویدا چاندی * که
چکوله‌تره له همو تویان : بلّا وختیکی گوره دبی : له همو شیناوردان
گوره‌تره و دبیته داریکی که طیرانی آسمان دیِن و ده لکانی ویدا
هلدنیشن *
٣٣ مثلیکی دیکی به وان گت:پادشایتی آسمان دشبهی به هویرترشیکی
که ژنیك گرتی و ده سَی کیلی اردیدا شاردیوه هتـا همو ترشا *

٣٤ یسوع همو اوانی بو جماعتان به مثلان قصی کرد : و بی مثل هیچ
٣٥ چتیك د گل اوان قصی نکرد * هتا کو تواو ببی او چتی که کتراوه
به دستی پیغمبر که دلّی : زاری خوم به مثلان لیك د کمَوه : چتانی
شاردراو له بناغی دنیایی بو وان قصان د کم *

٣٦ او وختی جماعتانی مرخص کرد و هاته مالی و شاگردانی وی
هاتنه کن اوی دیان گت : او مثلی گُرگَی زوی بو مه ترجمه بکه *
٣٧ او جوابی دا و کتی : اوی که توی چـاك دچینی کوری انسانـه *
٣٨ و زویَکه دنیا یه : و توی چاك مندالانی پادشایتین. بلّا گُر گه مندالانی
٣٩ شرین * و او دژمنی که اوانی چاند شیطانه و دروینه آخری دنیا یه :
٤٠ و دروینکران ملایکتانن * دنا چلونیکی گُرگه خر د کریتَوه و ده
٤١ آوریدا دسوتیندری : هر وا ده آخری دنیایدا دبی * کوری انسانی
ملایکتانی خوی دنیری و همو هل انگَوتوان و اوانی که بی شریعتی
٤٢ د کن له پادشایتی وی خر د کنوه * و اوان ده تندوری آوری داویژن :
٤٣ لوی گریان و چراندنی ددانان دبی * او وختی صادقان ده پادشایتی
بابی خویاندا و کو روژ دتروسکین . هر کس که گوی هیه با ببیی *

٤٤ پادشایتی آسمان دشبهی به خزینیکی که ده زوییکیدا شاردرا بووه :
که پیاویك پیدای کرد و شاردیوه : و له خوشحالی خوی چو و همو
چتی که هیبو فروشتی و او زویی کری *

٤٥ دیسان پادشایتی آسمان دشبهی به تاجریکی که له مروارییانی چاکی

٤٦ دگَرا * و که مرواریيکی به قیمت پیدا کرد چو و همو چتی که هیبو
فروشتی و اوی کری *
٤٧ دیسان پادشایتی آسمان دشبهی به توریکی که ده بحری هاویشترا
٤٨ و له همو جوریکی خر کردوه * و که پر بو لسرِ قراغی هلیان کیشا
و رونیشتن و چاکانیان ده قاپیدا خر کردوه : بلّا خراپانیان فری داوه
٤٩ دری * هر واش دبی ده آخری دنیایدا. ملایکتان وەدر دکون و
٥٠ خراپان له نیو صادقــان جوی دکنَوه * و اوان ده تنــدوری آوری
٥١ داویژن : لوی گریان و چراندنی ددانان دبی * اری انگو همو او
٥٢ چتانه تی گیشتون ؟ به وییان گت : بلی * و او به وانی گت : لبر
اوی هر خویندواریکی که بو پادشایتی آسمان تعلیم کراوه دشبهی به
صاحب مالیکی که له خزینی خوی چتانی تازه و کــون در دینی *
٥٣ و بو که وختیکی یسوع او مثــلانی تواو کردبو له اوی روی *
٥٤ و که هاته وطنی خوی اوانی ده کنشتی خویاندا تعلیم دا وها کــه
٥٥ عجایب مان و کتیان : او عقله و او قوتانی له کوی بوه ؟ * مگر اوه
کوری نجاری نیه ؟ اری دایکی وی به مریم بانگ ناکری و برایانی
٥٦ وی یعقوب و یوسف و شمعون و یهودا ؟* و خوشکانی وی اری همو
٥٧ لکن امه نین ؟ دنا او همو چتانه له کوي بوه ؟ * و به وی هلدنگوتران:
بلّا یسوع به وانی گت : پیغمبریك بی قدر نیه مگر ده وطن و ده مالی
٥٨ خویدا * و زور قوتانی لوی نکرد لبر بی ایمانی وان *

## باب ١٤

١:٢ داو وختیدا هیرودیس تیترارك نیوبانگی یسوعی بیست * و به
خذمتکارانی خوي گت : اوه یوحنّا تعمیـــددره . او له نیو مردوان
٣ هلستاوتوه و لبر اوی او قوتانه ده ویدا کار د کن * چونکه هیرودیس
یوحنّای گرتبو بستبو و ده بندیخانیدا هاویشتبو لبر خاطری هیرودیا
٤ ژنی فیلپوس برای خوی * چونکه یوحنّا به وی گت : بو تو درست
٥ نیه که اوت ببی * و طمای دبو که بیکوژی بلّا له خلــکی دترسا :
٦ چونکه اویــان به پیغمبر دزانی * بلا وختیــکی روژی بولــد بونی
هیرودیس بو : کچی هیرودیا سمای کرد ده نیویــدا و هیرودیسی
٧ خوشحال کرد * لبر اوی به سویند وعدی به وی دا که هر چی طلب
٨ بکا به وی بدا * بلّا او فیر کراو له دایکی خوی کتی : سری یوحنّا
٩ تعمیددر لیره لسر طبقیکی به من بده * و پادشا خمنــاك بو . بلّا لبر
سویندان و اوانی که دگلی لسر سفری رونیشتبون امری کرد کــه
١٠:١١ بیدریتی * و ناردی و سری یوحنّا ده بندیخانیدا بری * و سری
وی هیندرا لسر طبقیکی و به کچکی درا و او بردیه کن دایــکی
١٢ خوی * و شاگردانی وی هاتن و میتی وییان هلگرت و ناشتیان : و
چون و به یسوع خبریان دا *
١٣ وختیکی یسوع اوی بیست له اوی به گمی خوی وه‌لا کیشا بتنی
بو جییکی چول . و که خلکی اویان بیست له شاران به پیان وه‌دوای

به وی گت : اگر همو له تو هلبنگوترین امن قط هلنـا نگوتریم *
۳٤ يسوع به وی گت : راستی به تو دلّیم : داو شویدا : له پیش اوی دا
۳٥ که کلباب بخوینی : سَی جار له من حاشا د کی * پطروس به وی
گت : اگر بو من لازم بی که د گل اتو بمرم قط له تو حاشا نا کم .
و هر واش همو شا گردان کتیان *
۳٦ او وختی یسوع د گل اوان هاته جییکی که گتسیمانی بانگ د کرا:
و به شا گردانی گت : رونیشن لیره هتـا بچم لوی و دعـا بکم *
۳۷ و پطروس و او دو کورانی زبدي د گل خوی هلگرت و دستی پی
۳۸ کرد به خمنا کی و دلتنگی * او وختی به وانی گت : گیانی من زور
۳۹ خمنا که هتا مردنی : لیره بمینن و د گل امن به خبر بن * و کمیك
چو پیش و به سر روی دا کوت و دعای کرد دیگت : یا بابی من
اگر ممکن بی : با او پیاله له من رابری : بلّا نه و کو امن دموی بلّا
٤۰ و کو اتو دتوی * و هاته کنٔ شا گردان و اوانی نوستو پیدا کرد و به
پطروسی گت : اری نتان‌دتوانی یك سعات د گل امن به خبر بن ? *
٤۱ به خبر بن و دعا بکن هتا کو ده تجربـَی نکون . هلبته روح راضیه بلّا
٤۲ بدن ضعیفه * دیسان جاری دویم چو و دعای کرد دیگت : یا بابی
من اگر ممکن نابی که اوه رابری بجگه له وی که بیخوموه : با ارادی
٤۳ تو بی * و هات و دیسان اوانی نوستو پیدا کرد : چونکه چاوی وان
٤٤ گران بون * و اوانی بجی هیشت و دیسان چو و جاری سیُم دعای
٤٥ کرد و دیسان هر او قصی د گت * او وختی هاته کن شا گردان و به

وانی گت : اویستا بنون و بحسینـوه : اوتا او سعاته نیزیکه و کوری
٤٦ انسانی به دستانی گناحکاران تسلیم دکری * هلستن با بچین : اوتا
٤٧ اوی که امن تسلیم دکا نیزیکه * و که هیشتا او قصی دکرد اوتـا
یهودا : یکیك لو دوازدانه هات و غلبایکی زور دگل اوی به شیران
٤٨ و کتکان له لای کاهنانی گوره و پیرانی قومی * و تسلیمکری وی
نیشانیکی به وان دابو دیگت : اوی که ماچی دکم او هوه : بیگرن *
٤٩ وجی بجی هاته کن یسوع و کتی : سلام ای ماموستا و اوی ماچ کرد*
٥٠ بلّا یسوع به وی گت : ای دوست : لبر چی هاتوی ? او وختی هاتنه
٥١ پیش و دستانیان هاویشته سر یسوع و گرتیان * و اوتا یکیك له اوانی
که دگل یسوع بون دستی دریژ کرد و شیری خوی هلکیشا و لـه
٥٢ خذمتکاری کاهنی گوری دا و گوی وي بری * او وختی یسوع به
وی گت : شیری خوت بگیره‌وه جیی خوی : چونکه همو اوان که
٥٣ شیر هلدگرن به شیر هلاك دبن * یان فکر دکی که ناتوانم له بابی
خوم طلب بکم و هر اویستا پتر له دوازده لجیونی ملایکتان بو من
٥٤ بنیری ? * بلّا کتیبان چلون تواو دبن : که دلّین : که لازمه که وها
بیی *
٥٥ داو سعاتیدا یسوع باو غلبایانی گت : وکو بو سر جردیکی وه‌در
کوتون به شیران و کتکان هتاکو امن بگرن : هر روژ ده هیکلیدا
٥٦ رونیشتم و تعلیمم ددا و امنو نگرت * بلّا او همو بوه هتاکو کتیبانی
پیغمبران تواو بین. او وختی همو شاگردان اویان بجی هیشت و هلاتن*

٥٧ و اوانی که یسوع‌یان گرتبو بردیانه کنِ قیافا : کاهنی گوره :
٥٨ لکوی که خویندِواران وِ پیران خر ببونـوه * و پطروس لـِـه دووروه
وه‌دوای وی کوتِ هتا حصارِی کاهنی گوره و چو ژوری و د گــل
٥٩ خذمتکاران رونیشتِ هتا کو آخری ببینی * بلّا کاهنانی گوره وِ همو
مجلیسی کیخدایان له شایدی درو له سر یسوع د گَران هتا کو بیکوژن*
٦٠ وِ پیدایان ندکرد : هر چند زور شایدانی دروزن هاتنه پیش : بلّا ده
٦١ آخریدا دو هاتنه پیش * و کتیان : اوه کتویه : دتوانم هیکلی خلّای
٦٢ بروخینم و به سَی روژان درستی بکمـوه * و کاهنی گوره هلستا و
به وی گت : اری هیچ جواب نادی ؟ اوانه له سر اتو چی شایدی
٦٣ ددن ؟ * بلّا یسوع بی دنگ بو و کاهنی گوره جوابی دا و به وی
گت : به خلّای زندو سویندت ددم که اگر اتوی او مسیح کوری
٦٤ خلّای به مه بلّی * یسوع به وی گت : اتو کتت : بلّا به انگو دلّیم :
له وی پاش انگو کوری انسانی دبینن که له لای راستی قوتی رودنیشی
٦٥ و لسر هورانی آسمان دی * او وختی کاهنی گوره جلّی خوی دری
دیگت : کفری کرد : ایدی چی احتیاجیمان به شایدان هیه ؟ اوتا
٦٦ اویستا کفرو بیستوه * چی فکر د کن ؟ و اوان جوابیان دا و کتیان :
٦٧ لایقی مردنی یه * او وختی تفیان ده روی ویدا کرد و مستیان لی
٦٨ دا و هیندیك زلییان لی دا * دیان گت : به مه پیغمبریتی بکه : ای
٦٩ مسیح : او کییه که له توی دا ؟ * بلّا پطروس له دری ده حصاریدا
رودنیشت . و قره‌واشیك هاته کن اوی دیگت : اتوش د گل یسوع

٧٠ جلیلی بوی * بلاّ له روی هموان حاشای کرد دیگت : نازانم چی دلّي *
٧١ و که وەدر گوته دالانی یکی دیکه اوی دی و به وانی گت که لوی
٧٢ بون : اوه د گل یسوع ناصری بو * و دیسان حاشای کرد به سویندیکی:
٧٣ او پیاوی ناناسم * و له پاش کمیکی اوانی که لوی راوستا بون هاتنه
پیش و به پطروسیان گت : به راستی اتوش له واني چونکه قصه
٧٤ کردنی توش اشکرات د کا * او وختی دستی پی کرد که لعنت بکا
و سویند بخوا : او پیاوی ناناسم . و جی بجی کلباب خویندی *
٧٥ و پطروس او قصی یسوعی وەبیر هاتوه که کتبو : له پیش اوی دا
که کلباب بخوینی : سی جار له من حاشا د کی و وەدر کوته دری
و به تالي گریا *

## باب ٢٧

١ و که صبحینی زو بو همو کاهنانی گوره و پیرانی قومی تگبیریان
٢ کرد لسر یسوع که بیکوژن * و اویان بست و بردیان و به پیلاطوس
حاکمیان تسلیم کرد *
٣ وختیکی یهودا تسلیمکری وی دیتی که حکم لسر اوی کرا پشیمان
بووه و او سی دراوه زیوی بو کاهنانی گوره و پیران ورگیراوه *
٤ دیگت : گناحم کردوه که خوینی بی سوچم تسلیم کردوه . بلاّ اوان
٥ کتیان : به مه چی ؟ بو خوت دزانی * و او دراوه زیوی ده هیکلی
٦ هاویشت : وەدر کوت و چو خوی خنکاند * بلاّ کاهنانی گوره او

دراوه زیوه‌یان هلگرت و کتیان: درست نیه که اوانه ده خزینی هیکلی
۷ باویژین چونکه قیمتی خوینه * و تگبیریان کرد و زویی گوز کریان
۸ به وان کری بو قبرستانی غریبان * لبر اوی او زویه هتا اورو زویی
۹ خوین بانگ کراوه * او وختی تواو بو او چتی که کتراوه به دستی
یرمیا پیغمبر که دلّی : و او سی دراوه زیوه‌یان هلـگرت : قیمتی
۱۰ قیمتکراو : اوی که هیندیك له بنی اسرائیل قیمتیان لسر دانا * و
اوانیان دا به زویی گوز کری : چلونیکی رب به من امری کرد *
۱۱ بلّا یسوع لپیش حاکم راگیرا : و حاکم لي پرسی دیگت : اری
۱۲ اتو پادشای یهودیانی ؟ و یسوع به وی گت : اتو دلّي * و که کاهنانی
۱۳ گوره و پیران گلییان له وی دکرد : هیچ جوابی نـدا * او وختی
پیلاطوس به وی گت : اری نابیی چند چتانی ضدی تو شایدی ددن؟ *
۱٤ و له هیچ قصیکیش جوابی به وی ندا وها که حاکم زور عجایب ما *
۱٥ بلّا ده جیژنیدا حاکم عدتی بو که گرتویك بو خلکی برلا بکا : هر
۱٦ کس که ویستبایان * و داو وختیدا گرتویکی مشهوریان هبو نیوی
۱۷ براباس * دنا وختیکی اوان خر بونـوه پیلاطوس به وانی گت : کیهه
دتانوی که بو انگو برلا بکم : براباس یان یسوع که مسیح بانگ
۱۸ :۱۹ دکری ؟ * چونکه دیزانی که له بخیلی اویان تسلیم کردبو * بلّا
وختیکی لسر کرسي دیوان رونیشتبو : ژنی وی نـاردیه کن اوی
دیگت : دگل او صادقـی هیچ کارت نبی : چونکه اورو ده خـوندا
۲۰ له سببی وی زور اذیتم کیشاوه * بلّا کاهنانی گوره و پیران خلکیان

۲۱ فیر کرد که براباسی طلب بکن و یسوعی هلاك بکن * بلّا حاکم جوابی
دا و به وانی گت : کیهه لو دوانه دتانوی که بو انگو برلا بکم ؟
۲۲ و اوان کتیان براباسی * پیلاطوس به وانی گت : دنا دگل یسوع
که مسیح بانگ دکری چی بکم ؟ همو کتیان : با له سیــداری
۲۳ بدری * و او کتی : دنا چی خراپیــکی کردوه ؟ بلّا اوان هر پتر
۲٤ قیژاندیان دیان گت : با له سیداری بدری * وختیکی پیلاطوس دیتی
که هیچ فایدی نبو بلّا که شلوقی هر پتر دبو : آوی هلگرت و دستانی
خوی لپیش چاوی خلکی شوشت دیگت : امن بی خطام لو خوینی :
۲٥ بو خوتان دزانن * و همو قومی جوابیان دا و کتیان : خوینی وی لسر
۲٦ امه و لسر مندالانی مه بی * او وختی براباسی بو وان برلا کرد :
و که یسوع قامچی لی دابو تسلیمی کرد که له سیداری بدری *
۲۷ او وختی عسکرانی حاکم یسوعیان برده ژور دیوانخانی و همو
۲۸ فوجیان لسر اوی خر کردوه * و اویان روت کرد و جُبّـهیکی سور
۲۹ دهبر اویان کرد * و تاجیکیان له دروی چنی و له سری وییان دانا :
و قامیشیکیان به دستی راستی وی دا و چوکیان لپیش اوی دادا و
۳۰ گپیان پی دا دیان گت : سلام ای پادشای یهودیان * و تفیان لی کرد
۳۱ و قامیشکهیان هلگرت و له سری وییان ددا * و که گپیان پی دابو :
جُبّـکه له بر اویان داکند و جلّی خوی دهبریان کرد و بردیان که
له سیداري بدن *
۳۲ و که وهدر دکوتن پیاویك له کورینی : نیوی شمعون : پیدایان

٣٣ کرد : و اویان مجبور کرد که سیداری وی هلگری * و که هاتنه
٣٤ جییکی که گولگوتا بانگ دکری : یعنی جیی کاسی سر * شراپ
تیکل به زرداویان به وی دا که بخواتوه : و که چیشتی نیویست که
٣٥ بیخواتوه * و که اویان له سیداری دابو : جلّی وییان لنیو خویان بش
٣٦ کرد به پشك هاویشتنی * و رونیشتن و کشکی وییان لوی دکیشا *
٣٧ و له برەژوری سری وی خطانامی وییان دانا : وا نوسرابو : اویه
٣٨ یسوع پادشای یهودیان * او وختی دو جردان دگل اوی له سیداری
٣٩ دران : یکیك له لای راستی و یکیك له لای چپی * و ریبواران
٤٠ کفریان پی دکرد و سری خویان رادوشاند * و دیـان گت : ای
خراپکری هیکلی و درستکری وی ده سَی روژاندا : خوت خلاص
٤١ بکه اگر کوری خلّاي : و وره خواری له سیداری * هر واش کاهنانی
٤٢ گوره دگل خویندواران و پیران گپیان پی ددا و کتیان * ایدیکانی
خلاص کردوه : خوی ناتوانی خلاص بکا . پادشای اسرائیله . با
٤٣ اویستا بیته خواری له سیداری و ایمان به وی دینین * لسر خـلّای
توکولی کردوه : با او اویستا اوی خلاص بکا اگر له وی راضیه چونکه
٤٤ کتویه : کوری خلّام * و هر باو طرزه او جردانَش که دگل اوی
٤٥ له سیداری درابون خراپیان به وی دگت * بلّا له سعاتی ششم تاریکای
٤٦ لسر همو ارضی بو هتا سعاتی نویم * و به قد سعاتی نویم یسوع بـه
دنگیکی بلند قیژاندی دیگت : ایلی ایلی لما شبختنی ? یعنی یا خلّای
٤٧ منِ خلّای من : بو چي امنت بجيِ هیشتوه ? * بلّا هیندیك له اواني

که لوی راوستابون : وختیکی بیستیان کتیان : او الیاسی بانگ دکا *
٤٨ و جی بجی یکیك له وان لنگی دا و هوریکی هلگرت و له سر که
٤٩ پری کرد و لسر قامیشیکی دانا و دای به وی که بخواتوه * بلّا اوانی
دیکه کتیان : لي گری : با ببینین اگر الیاس بی که اوی خلاص
٥٠ بکا * و یسوع دیسان به دنگیکی بلند قیژاندی و روحی تسلیم کرد *
٥١ و اوتا : پردی هیکلی دو لت بو له سررا هتا خواری : و ارض لرزی
٥٢ و شاخان قلشان * و قبران اواله بونَوه و زور له بدنی مقدسان که
٥٣ نوستبون هلستانَوه * و له قبران وەدر کوتن و له پاش هلستانوی وی
٥٤ هاتنه شاری مقدس و بو زوران بیندران * بلّا یوزباشی و اوانی که
دگل اوی کشکی یسوعیان دکیشا : وختیکی دیتیان زلزله و او
چتانی که دبون زور ترسان دیان گت : به راستی اوه کوری خلّای
٥٥ بو * و زور ژنان که له جلیلی وەدوای یسوع کوتبون که خذمتی وی
٥٦ بکن لوی بون و له دوروه تماشایان دکرد * لنیو اوان مریم مگدلی
بو و مریم دایکی یعقوب و یوسی و دایکی کورانی زبدی *
٥٧ و که ایواری بو پیاویکی دولمند له اریماتیه هات : نیوی یوسف
٥٨ که بو خوشی شاگردی یسوع بو * او چو کن پیلاطوس و میتی یسوعی
٥٩ طلب کرد . او وختی پیلاطوس امری کرد که به وی بدری * و
٦٠ یوسف میتکَی هلگرت و اوی ده کتانی پاك پیچاوه * و اوی ده
قبری تازی خوی دانا که ده شاخیدا هلکندرابو : و بردیکی گوری
٦١ له درکی قبری خلور کردوه و روی * و مریم مگدلی و مریمی دیکه

٦٢ لوی بون و برامبری قبری رونیشتبون * و ده روژی دیکه دا : که له
پاش تدارکی بو : کاهنانی گوره و فریسیان لکن پیـــلاطوس خر
٦٣ بونـَوه * دیان گت : ای اغا : وەبیرمان دی که وختیکی او فریودره
٦٤ هیشتا زندو بو کتی : که له پاش سَی روژان هلدستموه * دنا حکمی
بکه که هتا سَی روژان کشکی قبری بکیشن : نبا شاگردان اوی
بدزن و به خلکی بلّین : له نیو مردوان هلستاوتوه و فریوی آخری له
٦٥ ای هولی خراپتر دبی * پیلاطوس به وانی گت : کیشکچیانو هیه :
٦٦ برون و کشکی بکیشن چلونیکی دزانن * و اوان چون و قبرکەیان
به کیشکچیان قایم کرد له پاش اوی که بردکەیان مور کردبو *

## باب ٢٨

١ بلّا ده آخری شموی ده هلاتنی روژی هولی حـــوتویدا : مریم
٢ مگدلی و او مریمی دیکه هاتن که قبری ببینن * و اوتا زلزلیکی گوره
بو : چونکه ملایکتی رب له آسمانی هاته خواری و چو بردکَی خلور
٣ کردوه و لسر اوی رونیشت * و روی وی وکو بروسکه بو و جلّی
٤ وی سپی وکو بفر * و له ترسی وی کیشکچیان لرزین و وکو مردو
٥ بون * بلّا ملایکت جوابی دا و به ژنکانی گت : انگو مترسین چونکه
٦ دزانم که له یسوعی له سیـداره دراو دگـَرین * لیره نیه چونکـه
هلستاوتوه چلونیکی کتی : ورن و ببینن جیی کـــه لی دریژ دبو *
٧ و زو برون و به شاگردانی وی بلّین که له نیو مردوان هلستاوتوه و
اوتا وەپیشو دکوی بو جلیلی : لوی اوی دبینن . اوتا به انگوم کتوه *

۸ و جی بجی له قبری وەدر کوتن به ترس و خوشحالی گوره و لنگیان
۹ دا که به شاگردانی وی خبر بدن * و اوتا یسوع به پیروی وانی چو
دیگت : سلام علیکم . و اوان هاتنه پیش و پیانی ویان گرت و
۱۰ سجدەیان لی کرد * او وختی یسوع به وانی گت : مترسین : برون
و به برایانی من خبر بدن که بو جلیلی بچن و لوی امن دبینن *
۱۱ بلّا وختیکی اوان دروین اوتا هیندیك له کیشکچیان هاتنه شاری و به
۱۲ کاهنانی گوره خبریان دا له همو چتانی که بون * و خر بونوه دگل
۱۳ پیران و تگبیریان کرد و دراوی زوریان به عسکران دا * دیان گت :
بلّین که شاگردانی وی ده شویدا هاتن و اویان دزی وختیکی امه
۱٤ نوستبوین * و اگر او چته بو گوی حاکمی بگا امه اوی راضی دکین
۱۵ و انگو خاطرجم دکین * و اوان دراوکەیان ورگرت و کردیان
چلونیکی فیر کران : و او قصه وەدر کوتوه لنیو یهودیان هتا اورو *
۱٦ بلّا او یازده شاگردانه چونه جلیلی بو او کیوی که یسوع به وان
۱۷ وعدی دابو * و که اویان دی سجدەیان لی کرد : بلّا هیندیك شکیان
۱۸ کرد * و یسوع هاته پیش و دگل اوان قصی کرد دیگت : همو
۱۹ حکمات ده آسماندا و لسر ارضی به من دراوه * دنا برون و همو
ملّتان شاگرن بکن به وی که اوان تعمید بکن به نیوی باب و کور
۲۰ و روح القدوس * و اوان تعلیم بدن که همو چتانی که به انگو حکمم
کردوه رای‌بگرن : و اوتا امن دگل انگوم همو روژان هتا آخری
دنیایی *

# انجیل مرقوس

## باب ۱

۱:۲ هولی انجیلی یسوع مسیح * چلونیکی نوسراوه ده اشعیا پیغمبر
دا : اوتا دنیرمه پیش روی تو ملایکتی خوم : اوی که ریك دخا ریی
۳ تو * دنگی بانگکریکی ده چولیدا دلّی : ریی رب حاضر بکن و
جادانی وی راست بکن *
٤ یوحنّا تعمیددر ده چولیدا پیدا بو و تعمیدی توبی بو بخشینی گناحان
٥ وعظ دکرد * و وەدر کوتنه کن اوی تواو ولاتی یهودیه و همو خلکی
اورشلیمی و له وی تعمید دکران ده چومی اردن دا به اقرار کردنی
٦ گناحانی خویان * و یوحنّا جلّی له توکی وشتری بو و پشتیندیکی چرم
۷ ده پشتیدا و کولّه و هنگوینی کیوی دخوارد * و وعظی دکرد دیگت:
له دوای من دی اوی که له من به قوتتره : اوی که امن لایق نیم
۸ که داییموه و بندی کوشی وی بکموه * امن انگوم به آوی تعمید
کرد بلّا او انگو به روح‌القدوس تعمید دکا *
۹ و بو داو روژاندا که یسوع له ناصرتی جلیلی هات و له یوحنّا ده
۱۰ اردن دا تعمید کرا * و جی بجی که له آوی وەدر کوت دیتی آسمانان
۱۱ اواله بونوه و روح وکو کوتریك هاته خواری سر اوی * و دنگیك

۱۲ له آسمانان هات : اتو کوری خوشوستی منی : له تو خوشحالم * و زو
۱۳ روح اوی وەدر خیسته چولی * و چل روژان ده چولیدا بو له شیطان
تجربه د کرا و د گل جانوران بو و ملایکتان خذمتی ویان د کرد *
۱٤ و له پاش اوی که یوحنّا تسلیم کرا : یسوع هاته جلیلی و وعظی
۱٥ انجیلی خلّای د کرد * و دیگت : وعده تواو بوه و پادشایتی خـــلّای
نیزیك بوه . توبی بکن و ایمان به انجیلی بینن *
۱٦ و که به قراغی بحری جلیلی دا دروی : شمعون و اندریّاس برای
۱۷ شمعونی دی که توریان ده بحری داویشت : چونکه توروان بون * و
یسوع به وانی گت : له دوای من ورن : و انگو د کمـــه تورووانی
۱۸ انسانان * و جی بجی تورانیان به جی‌هیشت و وەدوای وی کوتن *
۱۹ و که کمیك وەپیش کوتبو : یعقوب کوری زبدی و یوحنّا برای
۲۰ وی دی . اوانیش ده گمیدا تورانیان دچنیوه * و زو اوانی بانگ کرد
و بابی خویان : زبدی : ده گمیدا د گل کریکاران به جی هیشت و
وەدوای وی کوتن *
۲۱ و هاتنه نیو کفرناحوم و زو ده شمویدا چو نیو کنشتی و تعلیمی
۲۲ دا * و له تعلیمی وی مات بون : چونکه اوانی تعلیم ددا و کو کسیکی
۲۳ که حکماتی بی و نه و کو خویندواران * و زو ده کنشتی واندا پیاویك
۲٤ هبو که روحی پیسی د گل بو و قیژاندی * دیگت : چمان د گل تو
هیه : ای یسوع ناصری : اری هاتوی که امه هلاك بکی ؟ اتو دناسم
۲٥ که کیی : ای مقدسی خلّای * و یسوع هرشی لی کرد دیگت : بی

۲٦ دنگٔ به و له وی وەدر بکـــوه * و روحی پیس اوی الوز کرد و
۲۷ قیژاندی به دنگیکی گوره و له وی وەدر کوت * و همو عجایب مان
وها که له یکتریان دپرسی دیان گت : اوه چیه ؟ تعلیمیکی تازی به
۲۸ قوت . لسر روحانی پیسیش امر دکا و اطاعتی دکن * و نیوبانگی
وی زو وەدر کوت همو جی ده تواوی ولاتی دوری جلیلیدا *
۲۹ و جی بجی که له کنشتی وەدر کوتن : هــاتنه مالی شمعون و
۳۰ اندریّاس دگل یعقوب و یوحنّا * و خسوی شمعون به نوبتی کوتبو .
۳۱ و زو خبریان له وی به وی دا * و چو کن اوی : دستی گرت : هلی
۳۲ استاند : و نوبتی بری دا و خذمتی وانی کرد * و که ایواری بو :
۳۳ وختی روژ آوای : همو نخوشان و جنّدارانیان هینا کن اوی * و
۳٤ تواوی شاری له بر درکی خر بونوه * و زورانی که نخوش بون به
نخوشیانی جوی جوی صاغ کردوه و جنّانی زوری در کرد و نی‌یشت
که جنّان قصان بکن : چونکه اویان ناسی *
۳٥ و صبحینی زو هلستا و وەدر کوت و چو جییکی چول و لوی نویژی
۳٦ دکرد * و شمعون و اوانی که دگل اوی بون : له دوای وی کوتن *
۳۸:۳۷ و اویان پیدا کرد و به وییان گت : همو له تو دگَرین * و به وانی
گت : با بروینه جییکی دیکه : بو قصبانی نیزیك : که لویش وعظ
۳۹ بکم : چونکه بو اوی وەدر کوتوم * و هات و ده تواوی جلیلی ده
کنشتانی واندا وعظی دکرد و جنّانی در دکرد *
٤۰ و گولیك هاته کن اوی : لي طلب کرد و چوکی لیپش دا دا

٤١ و به وی گت : اگر بتوی دتوانی امن پاكـ بكیوه * و یسوع رحمی
کرد : دستی دریژ کرد : دستی لی دا و به وی گت : دموی : پاكـ
٤٢:٤٣ بـوه * و جی بجی گولیتی له سر اوی لا چو و پاكـ بووه * و قدغی
٤٤ لی کرد و جی بجی روانی کرد * و به وی گت : هوشیار به و به
هیچکس ملّی : بلّا برو خوت به کاهن نیشان بده و او قربانی بره
بو پاكـ بونوی خوت که موسی امری کردوه بو شایدی له سر اوان *
٤٥ بلّا او وەدر کوت و دستی پی کرد که زوری خبر بدا و که او قصی
بلاو بکا وها که او نیدتوانی به اشکرا بچیته نیو شاریکی : بلّا له دروه
ده جیی چولدا بو و له همو لایان دهاتنه کن اوی *

## باب ٢

١ و له پاش چند روژان دیسان هاته کفرناحومی و بیسترا که ده مالی
٢ دایه * و زوران خر بونوه وها که ایدي له بر درکش جی نما : و
٣ کلامی بو وان قصی دکرد * و هاتن و افلیجیکیان دهینا کن اوی که
٤ به چوار کس هلگیرا بو * و که نیان توانی نیزیکی وی بن لبر خلکی:
بانیان هلدری له جییکی که او لی بو . و که کُنیان کردبو دوشگی
٥ که او افلیجی تیدا کوتبو دایانهیشته خواری * و که یسوع باوری
٦ وانی دی باو افلیجی گت : روله گناحانی تو بخشراون * بلّا چند
کس له خویندواران لوی رونیشتبون و ده دلّی خویاندا فکریان دکرد*
٧ بو چی اوه وا قصان دکا ؟ کفر دلّی . کی دتوانی گناحان ببخشی

٨ بجگه له یکیکی یعنی خلّا ؟ * و یسوع جی بجی ده روحی خویدا زانی
که اوان ده خویاندا وا فکریان دکرد و به وانی گت : بو چی اوی
٩ ده دلّی خوتاندا فکر دکن * کیهه هاسانتره کــه به افلیــجی بلّی :
گناحانی تو بخشراون یان که بلّی : هلسته و دوشگی خوت هلگره
١٠ و بگـَری * بلّا هتاکو انگو بزانن که کوری انسانی حکماتی هیه
١١ لسر ارضی که گناحان ببخشی : باو افلیجی گت * به تو دلّیم : هلسته :
١٢ دوشگی خوت هلگره و برو مالی خوت * و هلستا و جی بجی دوشگی
هلگرت و وەدر کوت لپیش هموان وها که همو واق مان و شکری
خلّایان کرد دیان گت : چتی وهامان قط ندیوه *
١٣ و دیسان وەدر کوته کن بحری و همو خلکی هاتنه کن اوی و
١٤ اوانی تعلیم ددا * و که رادبرد : لیوی کوری حلفی دی ده گمر گیدا
رونیشتبو و به وی گت : وەدوای من بکوه . و هلستا و وەدوای وی
١٥ کوت * و بو که ده مالی ویدا رِونیشتبو و زور له راداران و گناحکاران
دگل یسوع و شاگردانی وی رونیشتبون چونکه زور بون و وەدوای
١٦ وی کوتبون * و خویندواران و فریسیان وختیکی دیتیان که دگل
راداران و گناحکاران دخوا : به شاگردانی وییان گت که دگــل
١٧ راداران و گناحکاران دخوا و دخواتوه * و که یسوع اوی بیست به
وانی گت : صاغان احتیاجی حکیمیان نیه بلّا نخوشان . نهاتوم که
صادقان بانگ بکم : بلّا گناحکاران *
١٨ و شاگردانی یوحنّا و فریسیان به روژو دبون : و هاتن و به وییان

گت : لبر چی شاگرادنی یوحنّا و شاگردانی فریسیان به روژو دبن :
١٩ بلّا شاگردانی تو به روژو نابن ؟ * و یسوع به وانی گت : اری دتوانن
خلکی داوتی به روژو بین وختیکی زاوا دگل اوانه ؟ وختیکی زاوا
٢٠ دگل اوانه ناتوانن به روژو ببن * بلّا روژان دین کـه زاوا له وان
٢١ دستیندری : و او وختی: داو روژیدا به روژو دبن * هیچکس پـَرویکی
تازه له جلّیکی کون نادا : اگر نه پینی تازه له کونی دبیتوه و دراو که
٢٢ خراپتر دبی * و هیچکس شراپی تازه ده مـَشکانی کون تی ناکا :
اگر نه او شراپه مـَشکان دقلشینی و شراپ و مـَشکان ضایه دبن :
بلّا شراپی تازه ده مـَشکانی تازه تی دکری *
٢٣ و بو که ده شمویدا به نیو زویان دا رادبرد و شاگردانی وی دستیان
٢٤ پی کرد به گـُل چنینی که دروین * و فریسیان به ویان گت : اوتا :
٢٥ بو چی دکن اوی که ده شمویدا درست نیه ؟ * و به وانی گت : اری
قط نتان‌خویندوه داود چی کرد وختیکی محتـاج و برسی بو : او
٢٦ و اوانی که دگل اوی بون * چلون وه‌ژور مالی خلّای کوت ده زمانی
ابیاتار : کاهنی گوره دا : و نانی رابواردني خوارد اوی که حلال نیه
که بخوا مگر بو کاهنان : و داشی به اوانی که دگل اوی بون ؟ *
٢٧ و به وانی گت : شمو بو خاطری انسانی بوه و نه انسان بو خاطری
٢٨ شموی * وهایه که کوری انسانی ربـّی شمویشه *

باب ٣

١ و دیسان چو کنشتی و پیاویك لوی هبو که دستیکی وشکی بو *
٢ و له وی سیاد بون که اگر ده شمویدا صاغی بکاتوه هتا کو گلیی لی
٣ بکن * و باو پیاوی که دسته وشککی بو کتی : هلسته نیوی *
٤ و به وانی گت : اری درسته ده شمویاندا چاکه کردن یان خراپه کردن:
خلاص کردنی گیانیکی یان کشتنی ؟ بلّا اوان بی دنگ بون *
٥ و به رق تماشای دورندور له وانی کرد : خمناك لبر غلیظی دلّی وان: و
باو پیاوی گت : دستت دریژ بکه . و دریژی کرد و دستی وی صاغ
٦ بووه * و فریسیان زو وەدر کوتن و دگل هیرودیان ضدی وی
تگبیریان کرد که چلون اوی هلاك بکن *
٧ و یسوع دگل شاگردان خوی بو کن بحری کیشا : و خلکیکی زور
٨ له جلیلی و له یهودیه وەدوای وی کوتن * و له اورشلیمی و له ادومیه
و لو لای اردن و له دوری صور و صیدون : جمعیکی زور : وختیکی
٩ بیستیان چند چتانی گوری دکرد : هاتنه کن اوی * و به شاگردانی
خوی گت که گمییکی چکوله بو وی حاضر بی لبر خلکی هتا کو
١٠ اوی ریك نکوشن * چونکه زورانی صاغ دکردوه وها که به سر اویدا
١١ دکوتن که دستی لی بدن هر کامیکی دردیان بو * و روحانی پیش
که تماشای ویان دکرد لپیش اوی دکوتن و هاواریان دکرد
١٢ دیان گت : اتو کوری خلّاي : * و هرشی زوری له وان کرد که اوی
اشکرا نکن *

١٣ و چو سر کیوی و اوانی که ویستی بانگی کرد و چونه کن اوی *
١٤ و او دوازدانی تاعین کرد که دگل اوی بین و که بیان‌نیری بو
١٥ ١٦:١٥ وعظ کردنی * و که حکماتیان ببی بو وه‌در خستنی خنّان * و او
١٧ دوازدانی تاعین کرد و شمعونی پطروس نیو نا * و یعقوب کوری
زبدی و یوحنّا برای یعقوب : و اوانی بوانرگس نیو نا یعنی کورانی
١٨ گرمی * و اندریّاس و فیلیپوس و برتولمای و متی و توما و یعقوب
١٩ کوری حلفی و تدی و شمعون قانوی * و یهودا اسخریوطی که اوی
تسلیم کرد *
٢٠ و هاته مالیکی و دیسان خلکی خر بونوه وها که نیان‌دتوانی نانیش
٢١ بخون * و که نیزیکانی وی بیستیان : وه‌در کوتن که اوی بگرن
چونکه کتیان : بی هوش بوه *
٢٢ و خویندواران که له اورشلیمی هاتبون کتیان که بعلزبولی هیه و
٢٣ که به مزنی جنّان جنّان در دکا * و اوانی بانگ کرد و به مثلان
٢٤ به وانی گت : چلون دتوانی شیطان شیطان در بکا ؟ * اگر پادشاییتیك
٢٥ لسر خوی جوی ببی او پادشاییتیه ناتوانی رابوستی * و اگر خانویك
٢٦ لسر خوی جوی ببی او خانوه ناتوانی رابوستی * و اگر شیطان لسر
٢٧ خوی هلبستی و جوی ببی او ناتوانی رابوستی بلّا آخری دبی * بلّا
هیچکس ناتوانی وه‌ژور مالی صاحب قوتی بکوی که اسبابانی وی
تالان بکا مگر او صاحب قوتی هولی ببستی و او وختی مالی وی
٢٨ تالان بکا * راستی به انگو دلّیم : که همو گناحیان به بنی آدمی

٢٩ دبخشرین و کفران هر چندیکی کفر بکن * بلا کسیکی که ضدی
روح‌القدوس کفر بلّی : بو وی بخشین نیه هتا ابد : بلا خطاداره به
٣٠ گناحی ابدی * چونکه کتیان : روحی پیشی هیه *
٣١ و دایك و برایانی وی هاتن : و که له دری راوستا بون ناردیانه
٣٢ کن اوی و بانگیان کرد * و خلکی له دوری وی رونیشتبون و به
٣٣ وییان گت : اوتا دایك و برایانت له دری له تو دگرین * و به وان
٣٤ جوابی دا و کتی : دایك و برایانی من کین ؟ * و تماشای اوانی کرد
٣٥ که له دوری خوی رونیشتبون و کتی : اوتا دایك و برایانی من * هر
کس که ارادی خلای بجی بینی : اوه برا و خوشك و دایکی من *

باب ٤

١ و دستی پی کرد دیسان به تعلیم دانی لکن بحری : و خلکیکی
زور لکن اوی خر بونوه وها که وه‌ژور گمییکی کوت و لسر بحری
٢ رونیشت و همو خلککه لکن بحری لسر ارضی بون * و اوانی چتانی
٣ زور تعلیم دا به مثلان : و ده تعلیمی خویدا به وانی گت * ببین : اوتا
٤ توچین وه‌در کوت که توی بچینی * و بو که وختیکی توی دچاند
٥ هیندیك کوته سر ریی و طیران هاتن و اویان خوارد * و هیندیك
کوته سر جییکی برداوی لکوی که گلی زوری نبو و زو روا چونکه
٦ ارضی قولی نبو * و که روژ هلات سوتاندی : و چونکه رگی نبو
٧ وشگ بو * و هیندیك کوته نیو دروان و دروان هلچون و اویان

۸ خنکاند و بری ندا * و هیندیك کوته سر ارضی چاك و بری هینا که
وەدر کوت و گوره بو و هتا یك و سی و یك و شیصت و یك و صدی
۹:۱۰ بری * و کتی : هر کس که گوي بیستنی هیه : با ببیی * و که بتنی
بو : اوانی که له دوری وی بون د گل او دوازدانه : لیبان پرسی له
۱۱ مثلان * و به وانی گت : به انگو دراوه که سرانی پادشایتی خلای
۱۲ بزانن : بلّا بو اوانی که له درین به مثلان همو چت دبی * هتا کو به
دیتنی ببینن و نناسن و به بیستنی ببین و نافامن : نبا ور گَرین و
۱۳ ببخشرین * و به وانی گت : اری او مثلی نازانن ؟ و چلون همو مثلان
۱۴:۱۵ دزانن ؟ * توچین کلامی دچینی * و اوانه اوانن لسر ریی : جییکی
کلام دچیندری و وختیکی دبین جی بجی شیطان دی و او کلامی
۱۶ چیندراو ده دلّی واندا لا دبا * و هر وا اوانه اوانن کـه لسر جیی
برداوی چیندراون : اوانی که وختیکی کلامی دبین : جی بجی به
۱۷ خوشی اوی قبول د کن * و هیچ رگ ده خویاندا نیه : بلّا دمیکی
دمینن . له پاشان وختیکی تنگانی یان اذیت لبر او کلامی پیدا دبی :
۱۸ جی بجی هلدنگون * و اوی دیکه اوانن که لنیو دروان چیندراون :
۱۹ اوانی که کلامی دبین * و خمی او دنیایی و فریوی مال و ارزوی
چتانی دیکه وەژوری وان د کون و کلامی دخنکینن و بی بر دبی *
۲۰ و اوانه اوانن که لسر ارضی چاك چیندراون : اوانی که کلامی دبین
و قبولی د کن و بر دینن : به سی و به شیصت و به صد *
۲۱ و به وانی گت : مگر چرا دی که لبن کیـلی یـان لبن تختی

٢٢ داندری ؟ اری نابی لسر پیچرا داندری ؟ * چونکه هیچ چتیك
شاردراو نیه که اشکرا نبی و چتیك به دزی نبوه که نیتـــه دری *
٢٣:٢٤ اگر کسیك گوي بیستنی هیه : با بیبی * و به وانی گت : تماشا بکن
که چی دبین . به هر پیوانیکی که دپیون : بو انگو دپیوری و زیاد
٢٥ بو انگو د کری * چونکه هر کس که هیـتی به وی ددری : و هر
کس که نیـتی اوی که هـَشیـَتی لي دستیندری *
٢٦ و کتی : هر وایه پادشایتی خلاّی : وکو پیاویکی که توی باویته
٢٧ سر ارضی * و دنوی و هلدستی شو و روژ و تو دروی و بلند دبی و
٢٨ او نازانی چلون * ارض له خویـَوه بر دینی : هولی گیا : له پاشان
٢٩ گـُل : له پاشان دنکی تواو ده گـُلّیدا * و وختیکی بر گیشتوه جی
بجی داس دنیری چونکه دروینه گـَیوه *
٣٠ و کتی : پادشایتی خلاّی چلون برانبر بکین ؟ یان به چی مثلیکی
٣١ اوی بنوینین * وکو دنکیکی خردل که وختیکی له ارضی بچیندری
٣٢ چکوله‌تره له همو تویان لسر ارضی * و که چیندراوه وه‌در دکوی
و گوره‌تر دبی له همو شیناوردان و لکانی گوره در دکا وها که طیرانی
آسمان دتوانن لبن سیبری وی هلبنیشن *
٣٣ و به مثلانی زور وکو اوانه کلامی بو وان قصی دکرد به قد اوی
٣٤ که بتوانن ببین * و بی مثله قصی دگل اوان ندکرد : بلاّ بتنی هموی
بو شاگردانی خوی بیان دکرد *
٣٥ و داو روژیدا : که ایواری بو : به وانی گت : با بپرینوه او بری *

۳٦ و که او خلکه‌یان مرخص کردبو : اویان هلگرت هر وکو ده گمیدا
۳۷ بو : و چند گمی دیکش دگل اوی بون * و گیژیکی گوری بای بو
۳۸ و شپولان لنیو گمییان ددا وها که گمی پر دبووه * و او له دواوه لسر
سنیریکی نوستبو . و وه‌خبریان هینا و به وییان گت : ای ماموستا :
۳۹ اری اتو دربند نی که امه هلاك دبین ؟ * و هلستا : و هرشی له بای
کرد و به بحری گت : بی دنگ به : لال به : و بـا ساکن بو و
٤۰ آرامیکی گوره بو * و بـه وانی گت : بو چی وا ترسه‌نو کن ؟
٤۱ چلونه که ایمانو نیه ؟ * و به ترسیکی گوره ترسان و به یکتریان گت :
دنا اوه کییه که با و بحریش اطاعتی وی دکن ؟ *

## باب ٥

۱:۲ و هاتنه او بری بحری بو ولاتی جره‌سنیان * و که له گمی وه‌در
کوت جی بجی توشی وی بو له قبران پیاویکی که روحی پیسی هبو *
۳ که جي وی ده قبراندا بو و هیچکس نیـدتوانی اوی ایـدی بـه
٤ زنجیرانیش ببستی * چونکه گلیك جاران بسترا بووه به کوتان و
زنجیران : و زنجیران به وی پساندرا بون و کوتان شکاندرا بون :
٥ و هیچکس نیدتوانی اوی رام بکا * و همیشه شو و روژ ده قبران
٦ و ده کیواندا بو و دیقیژاند و به بردان له خوي ددا * و که یسوعی
۷ له دوروه دی : لنگی دا و سجدی لی کرد * و قیژاندی به دنگیکی
بلند و کتی : چم دگل تو هیه ای یسوع کوری خلای تعالی . به

۸ خڵات سویند ددم : عاذابم مده * چونکه به وی دیگت : وەدر بکوه
۹ له او انسانی ای روحی پیس * و لی پرسی : نیوت چیه ? و به وی
۱۰ گت : نیوم لـَجیونه چونکه زورین * و زوری لی پاراوه که اوان
۱۱ له ولاتی وەدر نخا * بڵا لوی لکن کیوی گارانیکی گوری برازان
۱۲ له لوری بو * و لی پارانوه دیان گت : بمان نیره نیو برازان هتـا کو
۱۳ وەژور اوان بکوین * و اوانی اذن دا . و روحانی پیس وەدر کوتن
و چونه نیو برازان : و گارانکه خویـان له سربرەژوری هلـداشته
۱٤ بحری به قد دو هزار : و ده بحریدا خنکان * و برازوانان هلاتن و ده
شاری و دییاندا خبریان دا . و وەدر کوتن کـه ببینن چی بوه *
۱٥ و هاتنه کن یسوع و او جنّدارەیان دی رونیشتو و دەبر کراو و عاقل :
۱٦ اوی که لـَجیون تیدا بو : و ترسان * و اوانی که اویان دیبو : بو اوانیان
۱۷ گیراوه چلونیکی به سر جنّدار که هاتبو : و بحثی برازان * و دستیان
۱۸ پی کرد که لی بپارینوه که له سرحدانی وان بروا * و وختیکی چو
۱۹ نیو گمی اوی که جنّدار ببو لی پاراوه که دگل اوی ببی * و نی
یشت : بڵا به وی گت : بچو مالی خوت : کن اهلی خوت و به وان
خبر بده چی چتیکی گوره رب دگل اتوی کردوه و که رحمی به تو
۲۰ کردوه * و چو و دستی پی کرد ده دکاپولسدا که وعظ بـکا چی
چتیکی گوره یسوع دگل اوی کردبو : و همو عجایب مان *
۲۱ و که یسوع دیسان به گمی پریوه او بری : خلکیکی زور لکن اوی
۲۲ خر بونوه : و لکن بحری بو * و یکیك له مزنانی کنشتی نیـوی

٢٣ پایروس هات . و که اوی دی له بر پییانی وی کوت * و زوری لی
پاراوه و کتی : کچی چکولی من ده گیان الّایه دایه . بریا هاتبای
٢٤ و دستانت لسر اوی دانابا که خلاص بیتوه و بژی * و د گل اوی
روی : و خلکیکی زور وه‌دوای وی کوتن و اویان ریك د کُشی *
٢٥:٢٦ و ژنیکی که مدی دوازده سالان خوین له بر چونی هبو * و زور
زحمتی کیشا بو له حکیمانی زور : و هر چی که بوی خرجی کردبو و
٢٧ فایدی نببو بلّا هر خراپتر بو * وختیکی بحثی یسوعی بیست : هات
٢٨ دنیو خلکیدا له پشتوه و دستی له جلّی وی دا * چونکه کتی : اگر
٢٩ دستی لی بدم هر جلّیشی بی : صاغ دبموه * و جی بجی کانی خوینی
وی وشك بو و زانی ده بدنی خویدا که لــه نخوشی صــاغ بووه *
٣٠ و زو یسوع زانی ده خویدا که قوتیك له وی وه‌در کوت و اوری داوه
٣١ دنیو خلکیدا و کتی : کی دستی له جلّی من دا ؟ * و شاگردانی وی
به وییان گت : دبینی که خلکی اتو ریك د کُشن و دلّي : کی دستی
٣٢ له من دا ؟ * و تماشای دوری خوی د کرد که ببینی اوی که او چتی
٣٣ کردبو * بلّا ژنکه هات دترسا و دلرزی : دیزانی اوی که به سری
٣٤ هاتبو : و کوته پیشی و همو راستی به وی گت * او به وی گت :
ای کچ : ایمانی تو اتوی خلاص کردوه : به سلامتی برو و صاغ بَوه
٣٥ له دردی خوت * هیشتا او قصی د کرد هیندیك له مالی مزنی کنشتی
هاتن دیان گت : کچکت مرد : ایدی ماموستــای بو چی زحمت
٣٦ ددی ؟ * بلّا یسوع وختیکی بیستی او قصی که کترا : به مزنی کنشتی

۳۷ گت : مترسه فقط ایمان بینه * و نی‌یشت کس د گل اوی بچی بجگه
۳۸ له پطروس و یعقوب و یوحنّا برای یعقوب * و هاتنـــه مالی مزنی
کنشتی و گابوریکی دی و اوانی که د گریان و زور شینییان د کُرد *
۳۹ و که چو ژوری به وانی گت : بو چی شینی د کن و د گرین ? کُچکه
۴۰ نمردوه بلّا نوستوه * و پی پیکنین . بلّا او هموانی در کُرد و بابی
کچکی و دایکی و اوانی که د گل اوی بون هلی گرت و چو ژوری
۴۱ او جیی که کچکی لی بو * و که دستی کچکی گرت به وی گت :
۴۲ طلیتا قومی : که ترجمی اویه : ای کچ : به تو دلّیم : هلسته * و جی
۴۳ بجی کچکه هلستا و گَرا : چونکه دوازده سالانه بو * و جی بجی
۴۴ مات بون به ماتیکی گوره * و قدغی زوری له وان کرد که کَس او
چتی نزانی : و کتی که چتیکی خواردنی به وی بدری *

## باب ٦

۱ و له اوی وه‌در کوت و هاته وطنی خـــوی : و شاگردانی وی
۲ وه‌دوای کوتن * و که شمو داهات : دستی پی کرد که تعلیم بدا ده
کنشتیدا : و زوران که بیستیان عجایب مان دیان گت : اوه اوانی
له کوي بوه : و چی حکماتیکه که به وی دراوه ? و او قوتانی که
۳ به دستی وی د کرین ! * مگر اوه نجار کوری مریم و برای یعقوب
و یوسی و یهودا و شمعونی نیه ? و اری خوشکانی وی لیره لکن امه
٤ نین ? و له وی هلدنگوتران * و یسوع به وانی گت : پیغمبریك بی

قدر نیه مگر ده وطنی خوی و لنیو خزمانی خوی و ده مالی خویدا *
٥ و نیدتوانی لوی هیچ قوتیکی بکا بجگه له وی که دستی لسر چند
٦ نخوشان دانا و صاغی کردنوه * و عجایب ما له بی ایمانی وان . و
ده دییانی دورندور دگرا و تعلیمی ددا *
٧ و او دوازدانی بانگ کرد و دستی پی کرد که اوانی بنیری جوت
٨ جوت : و حکماتی لسر روحانی پیس به وان دا * و به وانی اسپارد
که چتیك بو ریی هلنگرن بجگه له عصایك تنیا : نه توربین : نه نان
٩ و نه دراو ده پشتیندیدا * بلا کالان ده پی کراو : و دو کراسان دەبر
١٠ مکن * و به وانی گت : هر جییکی که وەژور مالیکی دکون لوی
١١ بمینن هتا له اوی وەدر دکون * و هر جییکی که انگو قبول نکن
و گوی له انگو نگرن: وختیکی له اوی وەدر دکون : توزی لبن
١٢ پیانی خوتان بتکینن بو شایدی له سر اوان * و وەدر کوتن و وعظیان
١٣ دکرد که توبی بکن * و جنانی زوریان در دکرد و زور نخوشانیان
به رونی چور دکرد و صاغیان دکردنوه *
١٤ و هیرودیس پادشا بیستی ــ چونکه نیوی وی مشهور بو ــ و کتی:
یوحنا تعمیــددر له نیو مردوان هلتاندراوتوه لبر اوی او قوتانه ده
١٥ ویدا کار دکن * هیندیك کتیان که الیاسه و ایدیکان کتیان کــه
١٦ پیغمبریکه وکو یکیك له پیغمبران * بلا وختیکی هیرودیس بیستی
١٧ کتی : یوحنا که امن بی سرم کرد او هلستاوتوه * چونکه هیرودیس
بو خوی ناردبوی : یوحنای گرت و ده بندیخانیدا بستی بو خاطری

١٨ هیرودیا ژنی فیلپوس برای خوی * چونکه یوحنّا به هیرودیسی گت :
١٩ بو تو درست نیه که ژنی برای خوت بینی * هیرودیا غرضی لی بو
٢٠ و طمای بو که بیکوژی و نیدتوانی * چونکه هیرودیس له یوحنّـــا
دترسا . به پیاویکی صادق و مقدسی دزانی و دیپارازت . و کـــه
بیستی : له زور چتانی به شك بو و به خوشی گوی له وی دگرت *
٢١ و روژیکی مناسب بو که هیرودیس میمانییکی ده بولد بونی خویدا
٢٢ بو مزنانی خوی و سر کردان و ماقولانی جلیلی درست کرد * و که
کچی هیرودیا هاته ژوری و سمای کرد : هیرودیسی خوشحال کرد:
و اوانی که دگل اوی رونیشتبون . و پادشا به کچکی گت : هر
٢٣ چت دوی : له من طلب بکه و دتدمی * و سویندی بو وی خوارد :
٢٤ هر چی له من طلب بکی دتدمی هتا نیوی پادشایتم * و چو دری
و به دایکی خوی گت : چی طلب بکم ؟ و او کتی : سری یوحنّا
٢٥ تعمیددر * و زو چو ژوری به تالوکه بو کن پادشای : طلبی کرد و
کتی : دموی که هر اویستا سری یوحنّا تعمیددر لسر طبقیکی به
٢٦ من بدی * و پادشا زور خمناك بو : بلّا لبر سویندان و اوانی که دگلی
٢٧ لسر سفری رونیشتبون نیویست ردی بکاتوه * و جی بجی پادشا جلّابی
٢٨ نارد و امری کرد که سری وی بینی * و روی و سری ده بندیخانیدا
بری و سری وی هینا لسر طبقیکی و دای به کچکی و کچکه دای
٢٩ به دایکی خوی * و که شاگردانی وی بیستیان هاتن و میتی ویان
هلگرت و ده قبریکیان نا *

۳۰ و رسولان لکن یسوع خر بونوه و خبریان به وی دا له همو چتیك :
۳۱ هر چی که کردبویان و هر چی که تعلیمیان دابو * و او به وانی گت :
ورن انگو بو خوتان بتنی بو جییکی چول و کمیك بحسینوه : چونکه
۳۲ اوانی که دهاتن و دچون زور بون و فرصتی خواردنیشیان نبو * و به
۳۳ گمی بو جییکی چول بتنی چون * و که دروین خلکی اوانیان دی
و زوران اویان ناسی و له همو شاران به پیان پیکوه لنگیان ددا بو او
۳٤ جی : و وەپیش اوان کوتن * و که یسوع وەدر کوت جمعیکی زوری
دی و رحمی به وان داهات چونکه و کو مران بون که شوانیان نبی :
۳۵ و دستی پی کرد که اوانی زور چتانی تعلیم بدا * و که روژ الان
درنگ بو : شاگردانی وی هاتنه کنی و کتیان : جیّکه چوله و روژ
۳٦ الان درنگه * مرخصیان بکه هتاکو بو مزرایان و دییانی دورندور
۳۷ بچن و چتیکی بو خویان بکرن که بیخون * بلّا او جوابی دا و به
وانی گت : انگو به وان بدن که بخون . و به وییان گت : مگر
بچین و قیمتی دو صد دینار نان بکرین و به وانی بدین که بیخون ؟ *
۳۸ بلّا او به وانی گت : چند نانو هیه ؟ برون و ببینن . و که زانیان
۳۹ کتیان : پینج و دو ماسی * و به وانی امر کرد که هموان دسته دسته
٤۰ لسر گیای شین روبنیشینن * و رونیشتن کومَله کومَله : صد صد
٤۱ و پینجا پینجا * و او نانانه و دو ماسیانی هلگرت : روی ده آسمانی
کرد : ممبارکی کرد و نانکانی لت کرد و دای به شاگردان که
٤۲ لپیش اوان دابنین : و او دو ماسیانی بو هموان بش کرد * و همویان

٤٣ خوارديان و تیر بون * و له لتکان : دوازده قرتاله پریان هل گرتـوه
٤٤ و له ماسیانیش* و اوانی که لو نانانه‌یان خواردبو پینج هزار پیاو بون *
٤٥ و جی بجی شاگردانی خوي مجبور کرد که وه‌ژور گمی بکون
و لپیش بچن بو او بری بو بیت صیدا : هتا بو خوی خلکی مرخص
٤٦ بکا * و که اوانی مرخص کردبو : چو سر کیویکی که دعا بکا *
٤٧ و که ایوار داهات : گمی ده نیوه‌راستی بحریدا بو و او لسر وشکی
٤٨ بتنی * و اوانی دی که ده زحمتدا بون له صَولی : چونکه با ضدی
وان بو . و نیزیکی نوبی چوارمی شوی هاته کن اوان لسر بحری
٤٩ دگَرا و طمای بو که له وان تیپری * بلّا وختیکی اویان دی لسر
٥٠ بحری دگَرا فکریان کرد که غیبی یه : و قیژاندیان * چونکه همو
اویان دی و تیك چون . و جی بجی اوانی دواند و به وانی گت :
٥١ به غیرت بن امنم مترسین * و وه‌سر کوته کن اوان ده گمیدا و باکه
٥٢ آرام بو و ده خویاندا مات مان له حد به در * چونکه له نانان تی نگی
٥٣ بون : بلّا دلّیان غلیظ بو * و که پرینوه سر ارضی هاتنه گنیسارت
٥٤ و رایان گرت * و که له گمی وه‌در کوتن جی بجی اویان ناسی *
٥٥ و لنگیان دا دورندور ده همو او ولاتیدا و دستیان پی کرد که نخوشان
٥٦ لسر تختان هلگرن بو او جیی که دیان‌بیست که او لوی یه * و هر
جییکی ده دییان یان ده شاران یان ده مزرایاندا دچو : نخوشانیان ده
میدانانداد دادنا و طلبیان لی دکرد که دستی لی بدن اگر چی داوینی
جلّیشی بی . و هر کامیکی که دستیان لیدا صاغ بونوه *

## باب ۷

۱ و لکن اوی خر بونوه فریسیان و چندیك له خویندواران که له
۲ اورشلیمی هاتبون * و دیتیان که هیندیك له شاگردانی وی به دستانی
۳ چلکن یعنی نشوراو نانی دخون * ( چونکه فریسیان و همو یهودیان
هتا دستیان به زریفی نشون ناخون : به راگرتنی حـدیثی پیران *
۴ و که له بازاری دینوه : هتا نشون ناخون : و زور چتانی دیکش هیه
که هلیان گرتوه که رای‌بگرن و کو ششتنی جامان و افتاوان و قاپانی
۵ مس ) * و فریسیان و خویندواران لییان پرسی : لبر چی شاگردانی
تو وکو حدیثی پیران رفتار ناکن بلّا نان دخون به دستانی چلکن *
۶ بلّا او به وانی گت : به زریفی پیغمبرتی کرد اشعیا درحقی انگو :
ای ریاکاران : وکو نوسراوه : او طایفه به لیوان حرمتی من دگرن بلّا
۷ دلّی وان له من دوره * و به خورایی امن دپرستن به اوی که فیر دکن
۸ تعلیمان که امرانی انسانین * امری خلّای ترك دکن و حدیثی انسانی
۹ راد گرن * و به وانی گت : به زریفی امری خلّای بطال دکن هتا کو
۱۰ حدیثی خوتان رابگرن * چونکه موسی کتی : حرمتی باب و دایکی
خوت بگره : و اوی که جنیو به باب یان دایك بدا به مردن بمری *
۱۱ بلّا انگو دلّین : اگر کسیك به باب و دایکی خوی بلّی : او چتی
۱۲ که له منوه قازانج بو تو بگا قربان یعنی دیاریه * ایدی انگو نایلن که
۱۳ چتیکی بو دایك و بابی خوی بکا * کلامی خلّای بطال دکن بـه
حدیثی خوتان که داتان‌ناوه : و زور چتانی وکو اوانه دکن *

١٤ و دیسان خلککی بانگ کرد و به وانی گت : ببین له من هموتا؛
١٥ و بغامن * هیچ چتیك نیه که له دروی انسانی بچیته زوری بتوانی
پیسی بکا : بلا او چتانی که له انسانی وەدر د کون اوانن که انسانی
١٦ پیس د کن * اگر کنیك گوي بیستنی هیه : با ببیی *
١٧ و که له کن خلکی چو ژور مالی : شاگردانی وی لییان پرسی له او
١٨ مثلی * و به وانی گت : اری انگوش هر وا نغامن ? نازانن که هر
١٩ چی که له دروه وەژور انسانی دکوی ناتوانی پیسی بکا ? * چونکه
ناچیته نیو دلی وی بلا نیو زگی و ده مبالیدا دچیته دری به پاك کردنوی
٢٠ همو خوراکی * و کتی : او چتی که له انسانی وەدر د کوی او انسانی
٢١ پیس د کا * چونکه له ژوروه له دلی انسانی وەدر د کون فکری
٢٢ خراپ : فسق : دزی : قتل * زناح : طماح : خراپی : حیله : بدعملی :
٢٣ چاوپیسی : کفر : تشخسی : نفامی * همو او چتانی خراپ له ژوروه
وەدر د کون و انسانی پیس د کن *
٢٤ و هلستا و له اوی روی بو سرحدانی صور و چو ژور مالیکی و
٢٥ ویستی که کس نزانی و نیدتوانی ون بی * بلا جی بجی ژنیکی که
کچی چکولی وی روحی پیسی هبو بحثی وی بیست و هات و کوته
٢٦ بر پیانی وی * و ژنکه یونانی و به اصل خلکی فینیقیی شامی بو . و
٢٧ لی طلب د کرد که جنّی له کچی وی وەدر بخا * و او به وی گت :
له مندالان گری هولی تیر بخون : چونکه چاك نیه که نانی مندالان
٢٨ هلگری و بیاویژیه بر توتکان * بلا او جوابی دا و به وی گت : بلی

۲۹ ای رب : توتکانیش لبن میس له ورتکانی مندالان دخون * و به
۳۰ وی گت : لبر او قصی برو : جنـّکه له کچی تو وەدر کوتوه * و که
چووه مالی خوی کچکی پیدا کرد لسر دوشگی کوتوه و جنـکه وەدر
کوتبو *
۳۱ و که دیسان وەدر کوت له سرحدانی صور : به ریی صیدونی هاته
۳۲ بحری جلیلی ده نیوەراستی سرحدانی دکاپولسدا * و یکیکی کر و
لالاپتەیان هینا کن اوی و له وییان طلب کرد که دستی له سر دابنی *
۳۳ و اوی هلگرت له نیو خلکی بتنی : قامکانی خوی ده گویانی وی نا و
۳٤ تفی کرد و دستی له زمانی وی دا * و روی ده آسمانی کرد : آخی
۳٥ هلکیشا و به وی گت : افتّا یعنی بکریوه * و گویانی وی کرانوه و
۳٦ جی بجی گریی زمانی وی بر بو و به راستی قصی کرد * و قدغی
له وان کرد که به هیچکس نلین : بلا هر چند له وان قدغی دکرد :
۳۷ پتر بلاویان دکردوه * و له حد به در عجایب مان دیان گت : همو
چتی چاك کردوه . دیکا که کران ببین و که لالانیش قصان بکن *

## باب ۸

۱ داو روژاندا که دیسان خلکی زور بون و حیچیان نبو که بیخون :
۲ شاگردانی بانگ کرده کن خوی و به وانی گت : رحمم به او خلکی
دا دی چونکه الان سی روژه که دگل امنن و حیچیان نیه که بیخون *
۳ و اگر به برسیتی بو مالی خویان مرخصیان بکم ده رییدا له خو دبنوه :

٤ هیندیکیش له وان له دورین * و شاگردان جواییان به وی دا : له
کوی دتوانی کسیك اوانه به نانی لیره ده چولیدا تیر بـکا ؟ *
٥:٦ و له وانی پرسی : چند نانو هیه ؟ و اوان کتیان : حوت * و له خلکی
امری کرد که لسر ارضی روبنیشن . و او حوت نانانی هلگرت :
شکری کرد : لتی کرد و دای به شاگردانی خوی که دایبنینه پیش
٧ و لپیش خلکییان دانا * و چند ماسی چکولەیان بو و اوانی ممبارك کرد
٨ و کتی که اوانش لپیش دابنین * و خواردیان و تیر بون . و له لتکان
٩ که زیاد بون حوت زمبیلیان هلگرت * بلّا به قد چوار هزاری بون :
و اوانی مرخص کرد *
١٠ و جی بجی د گل شاگردانی خوی وەژور گمی کوت و هاته ولاتی
١١ دلمانوته * و فریسیان وەدر کوتن و دستیان پی کرد که مباحثه د گل
اوی بکن و نیشانیکیان له آسمانی له وی طلب د کرد هتا تجربـی
١٢ بکن * و ده روحی خویدا هناسی هلکیشا و کتی : بو چی او سلسله
نیشانی طلب د کا ؟ راستی به انگو دلّیم : باو سلسلی نیشانیك نادری*
١٣ و اوانی به جی هیشت و دیسان وەژور گمی کوت و پریوه او بری *
١٤ و له بیریان چوبو که نانی هلگرن و ده گمیدا بجگه له نانیکی :
١٥ پتر لکنیان نبو * و به وانی امر کرد دیگت : تماشا بگن : هوشیار بن
١٦ له هویرترشی فریسیان و هویرترشی هیرودیس* و د گل خویان فکریان
١٧ د کرد چونکه نانمان نیه * و که او زانی : به وانی گت : بو چی فکر
د کن که نانو نیه ؟ اری هیشتا تی ناگن و نافامن ؟ مگر دلّو غلیظه؟*

١٨ مگر چاوو هیه و نایینن : گویو هیه و نـایین و وه‌بیرو نـایی ؟ *
١٩ وختیکی او پینج نانانم بو پینج هزاری لت کرد چند قرتالی پرو برماو
٢٠ هلگرتـوه ؟ به وییان گت : دوازده * و وختیکی او حوته بو چوار
هزاری : اری چند زمبیلی پرو برماو هلگرتـوه ؟ و کتیان : حوت *
٢١ و به وانی گت : هیشتا تی ناگن ؟ *
٢٢ و هاتنه بیت‌صیدا و کویریکیان هینا کن اوی و لی پارانوه کـه
٢٣ دستی لی بدا * و دستی او کویری گرت : اوی له دیی برده دری و
تفی له چاوانی وی کرد : دستانی له سر دانا و لي پرسی : اری چتیکی
٢٤ دبینی ؟ * و که تماشای سروی کرد کتی : خلکی دبینم : چونکه
٢٥ چتیکی و کو داران دبینم که دگـرین * او وختی دیسان دستانی لسر
چاوانی وی دانا : و نواری و صاغ بووه و همو چتی به زریفی دی *
٢٦ و اوی ناردہ مالی خوی دیگت : مچو نیو دیی *
٢٧ و یسوع وه‌در کوت و شاگردانی وی بو دییانی قیصریی فیلپوس
و ده رییدا له شاگردانی خوی پرسی : به وانی گت : خلکی کی
٢٨ دلّین که امن بم ؟ * و اوان جواییان به وی دا دیان گت : یوحـنـا
٢٩ تعمیددر : و هیندیك الیاس : بلّا ایدیکان یکیك له پیغمبران * و او
له وانی پرسی : بلّا انگو کی دلّین که امن بم ؟ پطروس جوابی
دا و به وی گت : اتوی مسیح *
٣٠:٣١ و قدغی له وان کرد که بحثی وی به هیچکس نلّین * و دستی
پی کرد به فیر کردنی وان که لازمه که کوری انسانی اذیتی زور

بکیشی و رد بکری له پیران و کاهنانی گوره و خویندواران و بکوژری
٣٢ و له پاش سێ روژان هلبستیتوه * و او قصی به اشکرا گت : و پطروس
٣٣ اوی کیشا کنه خوی و دستی پی کرد که اوی مذمت بکا * بلّا او
ورگَرا و تماشای شاگردانی خوی کرد : له پطروسی تُند بو و کتی :
برو پشتوم ای شیطان : چونکه فکری چتانی خلّای ناکی بلّا چتانی
انسانی *
٣٤ و خلکی دگل شاگردانی خوی بانگ کرد و به وانی گت :
اگر کسیك بیوی له دوای من بی با له خوی ببوری و سیداری خوی
٣٥ هلگری و وەدوای من بکوی * چونکه هر کس که بیوی که گیانی
خوی خلاص بکا ونی دکا : بلّا هر کس که گیانی خوی لبر خاطری
٣٦ من و انجیلی ون بکا خلاصی دکا * چونکه بو انسانی چی فایدی یه
٣٧ اگر همو دنیایی قازانج بکا و گیانی خوی خسار بکا ؟ * چونکه چی
٣٨ ددا انسان له جیاتی گیانی خوی ؟ * چونکه هر کس که له من
و له کلامی من شرمی بکا لنیو او سلسلی زناحکار و گناحکار :
کوری انسانیش له وی شرمی دکا وختیکی دی ده جلالی بابی خوی
دا دگل ملایکتانی مقدس *

## باب ٩

١ و به وانی گت : راستی به انگو دلّیم که له راوستاوان لیره هیندیك
هن که مردنی قط ناچیژن هتا پادشایتی خلّای نبینن به قوت بی *

۲ و له پاش شش روژان یسوع پطروس و یعقوب و یوحنّای هلگرت
و اوانی برده سر کیویکی بلند بو خویان بتنی و لپیش اوان گورا *
۳ و جلّی وی بریقدار بون زور سپی وها که هیچ گازر کریك لسر ارضی
۴ ناتوانی وها سپی بکا * و الیاس د گل موسی بو وان بیندران و د گل
۵ یسوع قصه‌یان د کرد * و پطروس جوابی دا و به یسوعی گت : ای
رب : چاکه که امه لیره بین و با سَی کپران درست بکین : یکیك
۶ بو تو و یکیك بو موسی و یکیك بو الیاس * چونکه نیـدزانی چی
۷ جواب بدا چونکه زور ترسا بون * و هوریك بو که سیبری خسته سر
اوان و دنگیك له هوری هات : اویه کوری خوشوستی من : گوی
۸ لی بگرن * و زو : که تماشای دوری خویان کرد : بجگه له یسوع
۹ بتنی ایدی هیچ کسیان د گل خویان ندی * و که اوان له کیـوی
دهاتنه خواری : قدغی له وان کرد که بو کس نگیرنوه او چتانی
که دیبویان هتا وختیکی کوری انسانی له نیو مردوان هلدستیتوه *
۱۰ و او قصه‌یان لکن خویات را گرت و له یکتریان پرسی : هلستانوی له
۱۱ نیو مردوان چیه ؟ * و له وییان پرسی دیان گت : خویندواران دلّین
۱۲ که هولی دبی الیاس بی * و او به وانی گت : هلبته الیاس هولی
دی و همو چتی ریك دخا . و چلون نوسراوه له کوری انسانی ؟ که
۱۳ اذیتی زور د کیشی و بی حرمت د کری * بلّا به انگو دلّیم : کـه
الیاسیش هاتوه و هر چی که ویستیان د گل اویان کرد : وکو له وی
نوسراوه *

١٤ و که هاته کن شاگردان : خلکیکی زوری دی لـه دوری وان و
١٥ خویندواران که دگل اوان مباحثه‌یان دکرد * و جی بجی همو خلککه
وختیکی اویان دی شیوان و لنگیان دا کنی و سلاویان لی کرد *
١٦:١٧ و له وانی پرسی : دگل اوان چی مباحثه دکن ؟ * و یکیك لو
خلکی به وی جوابی دا : ای ماموستا : کوری خومم هیناوه کن اتو
١٨ که روحیکی لاڵی هیه * و هر وختیکی اوی دگری دیدری و کف
هلدخرینی و ددانی ده چیروه دبا و وشك دبی . و به شاگردانی توم
١٩ گت که اوی در بکن و نیان‌توانی * بلّا او به وان جوابی دا و کتی :
ای سلسلی بی ایمان : هتا کنگی دگل انگو بم : هتا کنگی له انگو
٢٠ صبری بکم ؟ اوی بهیننه کن امن * و اویان هینا کن اوی . و که روح
اوی دی جی بجی فی گرتی و کوته سر ارضی و دگـوزی و کفی
٢١ هلدخراند * و له بابی وی پرسی : چند وخته که او چته توشی وی بوه ؟
٢٢ او کتی : له مندالیـوه * و گلیك جـاران اوی ده آور و ده آوی
هاویشتوه هتا هلاکی بکا : بلّا اگر چتیك دتوانی : رحمی به مه بکه
٢٣ و یاریده‌مان بده * و یسوع به وی گت : اگر دتوانی : همو چت
٢٤ ممکنه بو وی که ایمان دینی * جی بجی بابی او مندالی هاواری کرد
٢٥ و کتی : ایمان دینم : کومگی بی ایمانی من بکه * و که یسوع دیتی
که خلکی به لنگدان دهاتن : هرشی له روحی پیسی کرد و به وی
گت : ای روحی لاڵ و کر : امن حکمت لی دکم : له اوی وه‌در
٢٦ بکوه و ایدی مچو نیو وی * و که قیژاندی و زوری دراند وه‌در کوت

٢٧ و و کو مردو بو وها که زوران کتیان که مردوه * بڵا یسوع دستی
٢٨ وی گرت : هلی استاند و هلستا * و که هاتـوه مالی : شاگردانی
وی لییان پرسی بتنی : بو چی امه نمان‌دتوانی اوی در بکین ؟ *
٢٩ و او به وانی گت : او طرزه به هیچ چتیك در ناکری مگر به دعا *
٣٠ و که له اوی روین : به نیو جلیلیدا رادبردن و نیدویست که کس
٣١ بزانی * چونکه شاگردانی خوی فیر دکرد و به وانی دگت : که
کوری انسانی تسلیم به دستی خلکی دکری و دیکوژن و که کوژرا :
٣٢ له پاش سَی روژان هلدستیتوه * بڵا اوان داو قصی نگیشتن و ترسان
که پرسیاری لی بکن *
٣٣ و هاته کفرناحوم و وختیکی ده مالیدا بو : له وانی پرسی : قصو
٣٤ له چی دکرد ده ریبدا ؟ * بڵا اوان بی دنگ بون چونکه ده ریبدا
٣٥ به یکتریان دگت : کیهه گوره‌تره * و که رونیشت او دوازدانی بانگ
کرد و به وانی گت : اگر کسیك بیـوه هول بی : آخری هموان
٣٦ دبی و خذمتکاری هموان * و مندالیکی گرت و لنیو اوان رایگرت :
٣٧ و که اوی ده باوشی گرت به وانی گت * هر کس که یکیك له
مندالانی و کو اوی به نیوی من قبول بکا امن قبول دکا : و هر کس
که امن قبول بکا : امن قبول ناکا : بڵا اوی که امنی ناردوه *
٣٨ یوحنّا به وی گت : ای ماموستا : یکیکمان دی که جنّانی به
نیوی تو در دکرد که وه‌دوای مه نکوی و منعمان لی کرد چونکه
٣٩ وه‌دوای مه ندکوت * بڵا یسوع کتی: معنی لی مکن چونکه هیچکس

نیه که قوتیکی به نیوی من بکا و بتوانی زو خراپ بحثی من بکا *
٤٠ چونکه هر کس که ضدی مه نیه : له لای مه یه *
٤١ چونکه هر کس که جامیکی آو به نیوی من به انگو بدا که
بیخونوه لبر اوی که انگو ای مسیحین : راستی به انگو دلّیم : حقی
٤٢ وی قط ون نابی * و هر کس که یکیك لو چکولانی که ایمان بینن
هلبنگوینی : بو وی چاتر دبو اگر برداشیك ده استوی وی بخرابایه
و ده بحری باویژرابایه *
٤٣ و اگر دستی تو هلت‌بنگوینی بیبره . چاتره بو تو که وەژور ژیانی
بکوی به کولی له وی که دو دست هبی و بچیه جهنمی دنیو آوری
٤٥ که ناکوژیتوه * و اگر پیی تو هلت‌بنگوینی بیبره . چاتره بو تو که
وەژور ژیانی بکوی به شَلی له وی که دو پیت هبی و باویژریه
٤٧ جهنمی * و اگر چاوی تو هلت‌بنگوینی دری ینه . چاتره بو تو که
وەژور پادشایتی خلّای بکوی به کویری له وی که دو چاوت هبی و
٤٨ باویژریه جهنمی * جییکی که کرمی وان نامری و آوری ناکوژیتوه *
٤٩:٥٠ چونکه هر کس به آور خُوی دکری * خُوی چاکه : بلّا اگر
خُوی بی تام ببی : به چی اوی سویر دکن ? با انگو خُویو پی بی :
و دگل یکتری بصُلحن *

باب ١٠

١ و له اوی هلستا و هاته سرحدی یهودیه و او لای اردن و خلکی
دیسان لکن اوی خر بونوه و وکو عادتی بو دیسان اوانی تعلیم ددا *

٢ و فریسیان هاتنه کن اوی و لییان پرسی هتاکو تجربی بکن : اری
٣ درسته که پیاو ژنی خوی برلا بکا ؟ * بلّا او جوابی دا و بـه وانی
٤ گت : موسی به انگو چی امری کردوه ؟ * و اوان کتیان : موسی
٥ اذنی دا که طلاقنامه بنوسری و برلا بکری * و یسوع به وانی گت :
٦ لبر دلّرقی انگو او حکمـَی بو انگو نوسی * بلّا له هولی خلق کردنی:
٧ خلّا اوانی نیر و می درست کرد * لبر اوی پیاو باب و دایکی خوی
به جی دیلی و د گل ژنی خوی جوت دبی * و او دوانه دبنه یك بدن
٩ وها که ایدی دو نین بلّا یك بدن * دنا اوی که خلّا جوتی کردوه
١٠ با انسان جوی ناکاتوه * و ده مالیدا دیسان شاگردان لییان پرسی
١١ له او چتی * و به وانی گت : هر کس که ژنی خوی برلا بکا و یکی
١٢ دیکه ماره بکا : ضدی وی زناح دکا * و اگر ژنیك میردی خوی
برلا بکا و میردیکی دیکه بکا زناح دکا *
١٣ و مندالانیان هینا کن اوی که دستی له وان بدا . بلّا شاگردان له
١٤ وان تـُند بون * بلّا وختیکی یسوع اوی دی ناقایل بو و به وانی گت:
له مندالان گرین که بینه کن امن و منعیان مکن چونکه پادشایتی
١٥ خلّای ای او طرزانه یه * راستی به انگو دلّیم : هر کس که وکـو
١٦ مندالیك پادشایتی خلّای قبول نکا قط وەژور اوی ناکوی * و اوانی
ده باوش گرت: دستانی لسر اوان دانا و اوانی ممبارك کرد *
١٧ و که وەدر دکوت ده رییدا یکیك لنگی دا کن اوی و چوکی
لپیش دا دا و لي پرسی : ای ماموستای چاك : چی بکم که ژیانی

۱۸ ابدی میرات بگرم ? * بڵا یسوع به وی گت : بو چی به من دڵي
چاك : هیچکس چاك نیه بجگه له یکیك یعنی خڵا * حکمان دزاني :
۱۹ قتلی مکه : زناحی مکه : دزی مکه : شایدی به درو مده : هلمفریوینه
۲۰ حرمتی باب و دایکی خوت بگره * بڵا او به وی گت : ای ماموستا :
۲۱ اوانم همو له جحیلیوه راگرتوه * و یسوع تماشای وی کرد : اوی
خوش ویست و به وی گت : چتیکت کمه : برو و هر چی که هته
بفروشه و به فقیرانی بده و خزینیکت ده آسماندا دبی و وره وەدوای
۲۲ من بکوه * بڵا او به خفت بو له سر او قصی و به خمناکی روی چونکه
۲۳ مالی زوری بو * و که یسوع تماشای دوروندوری کرد : به شاگردانی
خوی گت : چند زحمته بو وان که دولتیان هیه که وەژور پادشایتی
۲٤ خڵای بکون * و شاگردان له سر قصانی وی تعجوب مان . بڵا یسوع
دیسان جوابی دا و به وانی گت : ای مندالینه : چند زحمته که وەژور
۲۵ پادشایتی خڵای بکوی * هاسانتره که وشتریك به کُنی دَرزی تیوه
۲٦ بچی له وی که دولمندیك وەژور پادشایتی خڵای بکوی * بڵا اوان
زیاتر عجایب مان و به یکتریان گت : دنا کی دتوانی خلاص ببی ? *
۲۷ یسوع تماشای وانی کرد و کتی : لکن خلکی ناممکنه بڵا لکن خڵای
نه : چونکه همو چت لکن خڵای ممکنه *
۲۸ پطروس دستی پی کرد که به وی بلّی : اوتا امه همو چتمان به
۲۹ جی هیشتوه و وەدوای تو کوتوین * یسوع کتی : راستی به انگو دڵیم:
هیچکس لبر خاطری من و لبر خاطری انجیلی به جی نهیشتوه مال

یان برایان یان خوشکان یان باب یان دایك یان اولاد یـان زویان *
۳۰ مگر که وردگری صد اوانده الان داو زمانی دا مالان و برایان و
خوشکان و دایکان و اولادان و زویان د گل زحمتان و داو دنیایی که
۳۱ دی ژیانی ابدی * بلّا زوران که هولن دبنه آخر و آخران هول *
۳۲ و ده ریدا بون و وه‌سر د کوتن بو اورشلیمی و یسوع لپیش اوان
دروی و عجایب مان و اوانی که وه‌دوای د کوتن دترسان. و دیسان
او دوازدانی هلگرت و دستی پی کرد که به وان بلّی لو چتانی که به
۳۳ سر اوی دین * اوتا وه‌سر د کوین بو اورشلیمی و کوری انسانی تسلیم
به کاهنانی گوره و خویندواران دکری و حکمی لسر اوی به مردن
۳٤ دکن و اوی به بت‌پرستان تسلیم دکن * و گپی پی ددن و تفی لي
دکن و قمچی لي ددن و دیکوژن و له پاش سی روژان هلدستیتوه *
۳۵ و یعقوب و یوحنّا کورانی زبدی هاتنه کن اوی و به وییان گت:
ای ماموستا : دمانوی که بو مه بکی هر چی که امه لیت طلب دکین*
۳٦:۳۷ بلّا او به وانی گت : چو دوی که بو انگو بکم ؟ * و اوان بـه
وییان گت : بمان‌دیه که یکیك روبنیشین له راستی و یکیك له چپی
۳۸ تو ده جلالی خوت دا * بلّا یسوع به وانی گت: نازانن چی طلب د کن.
اری دتوانن او پیالی بخونوه که امن دیخوموه یان تعمید بکرین باو
۳۹ تعمیدی که امن پی تعمید دکریم ؟ * و اوان به وییان گت : دتوانین.
بلّا یسوع به وانی گت : او پیالی که امن دیخوموه دیخونوه و باو
٤۰ تعمیدی که امن پی تعمید دکریم تعمید دکرین * بلّا رونیشتن له

لای راستی یان چپی من او ایمن نیه که بیدم : بلّا بو اوانه که بو وان
٤١ حاضر کراوه * و که او ده‌یانه بیستیان : لسر یعقوب و یوحنّا دستیان
٤٢ پی کرد که ناقایل بین * و یسوع اوانی بانگ کرده کن خوی و به
وانی گت : انگو دزانن که اوانی که به مزنانی ملّتان حساب دکرین
حکماتی لسر اوان دکن و گورکانی وان دستلاتیان لسر اوان هیه *
٤٣ امّا لنیو انگو وا نبی : بلّا هر کس که بیوی لنیو انگو گوره ببی :
٤٤ خذمتکاری انگو دبی * و هر کس که بیوی لنیو انگو هول بی :
٤٥ عبدی هموان دبی * چونکه کوری انسانیش نهاتوه که خذمت بکری
بلّا که خذمت بکا و که گیانی خوی بدا بو بدلی زوران *

٤٦ و هاتنه یریخو . و که دگل شاگردانی خوی و خلکیکی زور له
یریخوی وه‌در کوت : برتیمای : کوری تیمای : سوالکریکی کویر
٤٧ لسر ریی رونیشتبو * و که بیستی که یسوع ناصریه : دستی پی کرد
٤٨ که بقیژینی و بلّی : یا یسوع کوری داود : رحمی به من بکه * و زوران
له وی تُند بون که بی دنگ بی : بلّا او هر پتر قیژاندی : یا کوری
٤٩ داود : رحمی به من بکن * و یسوع راوستا و کتی : بانگی بکن . و
او کویره‌یان بانگ کرد و به وییان گت : به غیرت به : هلسته :
٥٠ بانگت دکا * و جُبّی خوی فری دا : هلستا و هاته کن یسوع *
٥١ و یسوع به وی جوابی دا و کتی : چت دوی که بو تو بکم ? و او
٥٢ کویره به وی گت : یا رب که ببینم * و یسوع به وی گت : برو :

ایمانی تو اتوی خلاص کردوه . و جی بجی دیتی و وەدوای وی
کوت ده رییدا *

باب ١١

١ و که نیزیکی اورشلیمی بون : بو بیت‌فگی و بیت‌عنیا لکن کیوی
٢ زیتونی : دوانی له شاگردانی خوی نارد * و به وانی گت : برونه
او دیی که لپیش تانه و جی بجی که چونه ژور اوی: جاشکیکی بستراو
پیدا دکن که هیشتا هیچکس لسر اوی رونیشتوه . اوی بکنَوه و
٣ بیهینن * و اگر کسیك به انگو بلّی : بو چی اوی دکن ? بلّین : رب
٤ محتاجی وی یه و جی بجی دینیریتوه ایره * و چون و او جاشکه‌یان
پیدا کرد بستراو لکن درکی له دروه لسر ریی و اویان کردوه *
٥ و هیندیك له راوستاوان لوی به وانیان گت : چی دکن که او جاشکی
٦ دکنَوه ? * بلّا اوان به وانیان گت : وکو یسوع کُتبوی و لییان
٧ گران * و او جاشکه‌یان هینا لکن یسوع و جلّی خویان هاویشته سری
٨ و لسر اوی رونیشت * و زوران جلّی خویان لسر ریی راخست بلّا
ایدیکان لکان که له زویانیان بری *
٩ و اوانی که له پیشی دروین و اوانی که له دوای دهاتن دیان‌قیژاند
١٠ هوصعنّا ممبارك بی اوی که به نیوی رب دی * ممبارك بی پادشایتی
١١ بابی مه داود که دی : هصعنّا ده بلنداندا * و وەژور اورشلیمی و
هیکلی کوت . و که تماشای دورندور له همو چتی کردبو و که ایوار
داهات وەدر کوت بو بیت‌عنیای دگل دوازدان *

١٢ و ده صبحينيدا : وختيكى وەدر كوتن له بيت‌عنياى برسى بو *
١٣ و كه له دوروه دارەهنجيريكى دى كه گلاى هبو : هات كه بشكم
چتيكى لسر اوى پيدا بكا . و كه هاته كن اوى هيچى پيدا نكرد
١٤ بجگه له گلا چونكه وختى هنجيرى نبو * و جوابى دا و به وى گت :
له وى پاش هتا ابد هيچكس ميوى له تو نخوا . و شاگردانى وى
بيستيان *
١٥ و هاتنه اورشليمى : و كه وەژور هيكلى كوت دستى پى كرد كه
اوانى در بكا كه ديان كرى و ديان‌فروت ده هيكليدا و تختانى صرافان
١٦ و كرسيانى كوترفروشانى ورگيرا * و نى‌يشت كه كسيك قاپيكى
١٧ به نيو هيكليدا برى * و تعليمى دا و به وانى گت : ارى نوسراوه
كه مالى من مالى نويژ بانگ دكرى بو همو طايفان ؟ بلّا انگو اوو
١٨ كردوته اشكوتى جردان * و كاهنانى گوره و خويندواران بيستيان
و حوليان دا چلون اوى هلاك بكن چونكه لى دترسان لبر اوى كه
همو خلكى له تعليمى وى عجايب دمان *
١٩:٢٠ و كه ايوار داهات وەدر كوته درى له شارى * و صبحينى زو كه
٢١ رادبردن او دارەهنجيرەيان دى كه له رگيوه وشك بوه * و پطروس
وەبيرى هاتـوه و به وى گت : اى رب ببينه : او دارەهنجيرى كه
٢٢ لعنتت لى كرد وشك بوه * و يسوع جوابى دا و به وانى گت : ايمانو به
٢٣ خلّاى بى * راستى به انگو دلّيم : هر كس كه باو كيـوى بلّى :
هلبگيريى و ده بحريدا فرى بدريى و شكى ده دلّى خويدا نكا بلّا باور

۲٤ بکا که هر چی که بیلّی دبی : بو وی دبی * لبر اوی به انگو دلّیم :
هر چی که دپارینوه و طلب د کن : باور بکن که وه گیرو کوتوه و بوو
۲٥ دبی * و وختیکی رادوستن و دعا د کن : اگر لسر کسیکی چتیکو
هبی ببخشن هتا کو بابی انگوش که ده آسمان دایه زلّانو به انگــو
۲٦ ببخشی * بلّا اگر انگو نبخشن : بابی انگو که ده آسمان دایه : زلّانی
انگوش نابخشی
۲۷ و دیسان هاتنه اورشلیمی . و که او ده هیکلیدا د گـَرا کاهنانی
۲۸ گوره و خویندواران و پیران هاتنه کن اوی * و به وییان گت : به چی
حکماتیکی اوانه د کی:یان کی او حکماتی به تو داوه که اوانه بکی؟*
۲۹ بلّا یسوع به وانی گت : تاقه قصیکی له انگو دپرسم و به من جواب
۳۰ بدن و امنیش به انگو دلّیم به چی حکماتیکی اوانــه د کم * اری
تعمیدی یوحنّـا له آسمانی بو یان له انسانی ؟ به من جواب بدن *
۳۱ و لنیو خویان فکریان د کرد دیان گت : اگر بلّیین : له آسمانی : دلّی :
۳۲ دنا لبر چی به وی باورو نکرد ؟ * بلّا اگر بلّیین : له انسانی ــ له
۳۳ خلکی ترسان چونکه لکن هموان یوحنّا به راستی پیغمبر بو * و جوابیان
به یسوعی دا و کتیان : نازانین . و یسوع به وانی گت : امنیش به
انگو نالّیم به چی حکماتیکی اوانه د کم *

باب ۱۲

۱ و دستی پی کرد که به مثلان د گل اوان قصان بکا : پیاویك رزیکی
چقاند و پرژینی ده دوری گرت و چرزیکی هلقند و برجیکی لی

٢ درست کرد و اوی به رزوانان اسپارد و سفری کرد * و ده وختی
خویدا خذمتکارایکی نارده کن رزوانان هتا کو له رزوانان حاصلی رز
٣:٤ بستینی * و اویان گرت و کتایان و به بطالی ناردیانوه * و دیسان
خذمتکاریکی دیکی نارده کن اوان و اویشیان سر شکانـد و بی
٥ حرمتیان کرد*و یکیکی دیکی نارد و اویان کشت و زوری دیکی نارد:
٦ هیندیکیان کتا و هیندیکیان کشت*ایدی یکیکی هبو: کوریکی‌خوشوست.
ده آخریدا اوی نارده کن اوان دیگت : له کوری من شرمی د کن *
٧ بلاّ او رزوانانه دنیو خویاندا کتیان : اوه میراتگره : ورن با بیکوژین
٨ و میرات ایمه دبی * و گرتیان : اویان کشت و له رزیان خسته دری *
٩ اری صاحبی رز چی د کا؟دی و او رزوانانه هلاك د کا و رز به ایدیکان
١٠ ددا * اری او نوسینشو نخویندوه ؟ او بردی که بنّایان فرییان دا او
١١ بو به سری قُلنچکـَی * اوه له لای رب بوه و لپیش چاوی مه عجایبه*
١٢ و طمایان بو که اوی بگرن بلاّ له خلکی ترسان چونکه تی گیشتن که
او مثلی درحقی وان گت . و اویان بجی هیشت و روین *
١٣ و هیندیك له فریسیان و له هیرودیانیان نارده کن اوی که اوی به
١٤ قصه بگرن * و که هاتن به وییان گت : ای ماموستا : دزانین که اتو
راستی و که دربندی کس نی چونکه تماشای روی خلکی ناکی بلاّ
به راستی ریی خلاّی فیر د کی : اری درسته که سرانی به قیصری
١٥ بدین یان نه ؟ بیدین یان نیدین ؟ * بلاّ او ریاي وانی زانی و به وانی
گت : بو چی امن تجربه د کن ؟ دیناریك بینه کن امن که بیبینم *

١٦ و اوان هینایان . و به وانی گت : او شکل و خطه ای کییه ؟ و به
١٧ وییان گت: ای قیصری * و یسوع به وانی گت : چتی ای قیصری
به قیصری بدن و چتی ای خلّای به خلّای . و له وی عجایب مان *
١٨ و صدوقیان هاتنه کن اوی : اوانی که دلّین که قیامت نیه : و
١٩ لییان پرسی دیان گت * ای ماموستا : موسی بو مَـی نوسیوه : اگر
کسیك برای بمری و ژنیك به جی بیلی و اولاد به جی نایلی : که
٢٠ برای وی دبی او ژنی بینی و توی برای خوی هلبستینی * حوت برا
٢١ هبون و ای هول ژنیکی هینا : و که مرد توی بجی نهیشت * و ای
دویم اوی هینا و مرد که توی بجی نهیشت . و هر واش ای سیُم *
٢٢ و او حوتانه اویان هینا و تویان بجی نهیشت . و آخری هموان ژنکش
٢٣ مرد * ده قیامتیدا وختیکی هلدستنوه ژنی کیهه له وان دبی : چونکه
٢٤ هر حوتان اویان ژن ببو * یسوع به وانی گت : مگر لبر اوی نیه که
٢٥ خوتان هلدخلتینن که نه کتیب دزانن و نه قوتی خلّای ؟ * چونکه
وختیکی له نیو مردوان هلدستنوه نه ماره د کن و نه ماره د کرین : بلّا
٢٦ وکو ملایکتانن که ده آسمان دان * بلّا بحثی مردوان که هلدستنوه
اری نتان‌خویندوه ده کتیبی موسی دا لکن دروی چلون خلّا قصی
د گل اوی کرد دیگت : امنم خلّای ابراهیم و خلّای اسحق و خلّای
٢٧ یعقوب ؟ * او خلّای مردوان نیه : بلّا ای زندوان . خوتـان زور
هلدخلتینن *
٢٨ و یکیك له خویندواران که مباحثی وانی بیست : هـاته پیشی

وختیکی دیتی که جوابی چاکی به وان دا : و لی پرسی : حکمی هولی
٢٩ هموان کیهه یه ؟ * یسوع جوابی دا : ای هول اویه : ببیه ای اسرائیل :
٣٠ رب خلّای مه ربّیکی تنیایه * و دبی بجبینی رب خلّای خوت به همو
٣١ دلّت و به همو گیانت و به همو فکرت و به همو قوتت * و ای دویم
اویه : جیرانی خوت دبی بجبینی و کو خوت. حکمیکی دیکه له اوانه
٣٢ گوره‌تر نیه * و او خویندواره به وی گت : چاك ای ماموستا : به راستت
٣٣ گت که تنیایه و بجگه له وی ایدیکه نیه * و که اوی بجبینی به همو
دلّ و به همو عقل و به همو قوت : و که جیران بجبینی و کو خوی
٣٤ زور پتره له همو قربانانی سوتاندنی و کشتنوی * و که یسوع دیتی
که به عقلی جوابی دا : به وی گت : له پادشایتی خلّای دور نی . و
له وی پاش هیچکس نیدویرا که پرسیاری لی بکا *
٣٥ و یسوع جوابی دا و کتی وختیکی تعلیمی ددا ده هیکلیـــدا :
٣٦ خویندواران چلون دلّین که مسیح کوری داودیه ؟ * داود بو خوی
ده روح‌القدوس دا کتی : رب به ربّی من کتی : له لای راستی من
٣٧ رونیشه هتا دژمنانی تو لبن پیانی تو دابنیم * داود بو خوی اوی به
رب بانگ د کا : دنا له کوی او کوری وی یه ؟ و او خلکه زوره
به خوشی گویان لی د گرت *
٣٨ و ده تعلیمی خویدا کتی : هوشیار بن له خویندواران که کیفیان
لی یه که به جلّی دریژ بگـرن و پیان خوشه سلاوان ده میدانانَدا *
٣٩ و کرسیانی بره‌ژور ده کنشتاندا و جیـــانی ژورو ده میمانیـــاندا *

٤٠ اوانی که مالانی بیوەژنان قوت ددن و به ریاي نویژانی دریژ دکن .
اوانه دیوانی گرانتر وردگرن *
٤١ و یسوع برامبر صندوقی خزینی رونیشت و تماشای دکرد چلون
خلکی دراویان ده خزینی داویشت . و زور دولمندان زوریان تی
٤٢ داویشت * و بیوەژنیکی فقیر هات و دو فلوسی تی هاویشتِ : که
٤٣ پولیکه * و شاگردانی خوی بانگ کرد و به وانی گت : راستی به
انگو دلّیم : که او بیوەژنه فقیره پتری تی هاویشت له همو اوانی که
٤٤ ده خزینەیان هاویشت * چونکه همو له زیادی خویان تی هاویشت :
بلّا اوه له فقیری خوی هر چی که بوی : همو بریچونی خوی تی
هاویشت *

## باب ۱۳

١ و که او له هیکلی وەدر دکوت یکیك له شاگردان به وی گت :
٢ ای ماموستا : تماشا بکه چی بردانی و چی جور عمارتان * و یسوع
به وی گت : اری دبینن او عمارتانی گوره ؟ برد لسر برد قط نامینی
که نروخیندری *
٣ و که او لسر کیوی زیتونی برامبری هیکلی رودنیشت : پطروس
٤ و یعقوب و یوحنّا و اندریّاس بتنی لییان پرسی * به مه بلّی کنگی
٥ اوانه دبن ؟ و نیشانی چیه وختیکی اوانه همو تواو دبن ؟ * بلّا یسوع
دستی پی کرد که به وان بلّی : هوشیار بن که هیچکس انگو
٦ هلنخلتینی * زوران به نیوی من دین و دلّین که امنم و زوران

٧ هلدخلتینن * امّا وختیکی له شران و خبری شران دیین مشیوین :
٨ لازمه که ببی : بلّا هیشتا آخری نیه * چونکه ملّت لسر ملّت راست
دبیتوه و پادشایتی لسر پادشایتی : و زلزلان ده جی جیاندا دبن و
٩ قاطیان دبن . اوانه هولی ژانانن * بلّا انگو بو خوتان هوشیار بن .
اوان انگو به مجلیسی کیخدایان تسلیم دکن و ده کنشتاندا دکترین
و لپیش حاکمان و پادشایان راد گیرین لبر خاطری من : بو شایدی
١٠ لسر اوان * و لازمه که هولی او انخیلی بو همو ملّتان وعظ بکری *
١١ و وختیکی اوان انگو دبن و تسلیمو دکن : خمی مخون ده پیشدا که
چی قصان بکن : بلّا هر چی که به انگو داو ساعتیدا بدری : اوی
قصان بکن : چونکه انگو نین که قصان دکن بلّا روح‌القدوسه *
١٢ و برا برای به مردنی تسلیم دکا و باب اولادی : و اولادان لسر
١٣ والدین راست دبنوه و دیان کوژن * و انگو لکن همو خلکی
دبغضیندرین لبر نیوی من : بلّا اوی که هتا آخری صبری بکا او
خلاص دبی *
١٤ بلّا وختیکی ناحزی ویرانی راوستاو له جییکی که نابی ببی دیینن
اوی که دیخوینی با بفامی ــ او وختی اوانی که ده یهودیی دان با
١٥ بو کیوان هلین * اوی که لسر بانیه با نیته خواری و نچیته ژوری
١٦ که چتیکی له مالی خوی هلگری * و اوی که ده زوي دایه با نگریته
١٧ او چتانی پاشوه که جلّی خوی هلگری * امّا وای بو آوسان و
١٨ شیردران داو روژاندا * بلّا دعا بکن که ده زستانیدا نبی *

۱۹ چونکه داو روژاندا وها تنگانیك دبی که وکو اوی له هولی خلق
۲۰ کردنی که خلّا خلقی کرد هتا اویستا نبوه و قطیش نابی * و اگر
رب او روژانی کورت نکردبایه هیچ گیانیك خلاص ندبو : بلّا
۲۱ لبر هلبژیراوان که هلی‌بژادوه او روژانی کــورت کردوه : و او
وختی اگر کسیك به انگو بلّی : اوتا مسیح لیره یه یان اوتا لوی :
۲۲ باور مکن * چونکه مسیحانی دروزن و پیغمبرانی دروزن راست دبنوه
و نیشانان و عجایبان دکن هتا کو : اگر ممکن ببی : هلبژیراوانیش
۲۳ هلبخلتینن * بلّا انگو هوشیار بن . همو چتم ده پیشدا به انگو کتوه *
۲٤ بلّا داو روژاندا : له پاش او تنگانی : روژ تاریك دبی و مانگ
۲۵ روناکای خوی نادا * و استیران له آسمانی بر دبنوه و قوتان که ده
۲٦ آسمانان دان دلرزن * و او وختی کوری انسانی دبینن ده هوراندا
۲۷ به قوتی زور و جلال دی * و او وختی ملایکتان دنیری و هلبژیراوانی
خوی خر دکاتوه له چوار بایان : له پری ارضی هتا پری آسمان *
۲۸ بلّا له داره‌هنجیری او مثلی فیر بن : وختیکی لکی وی تازه
۲۹ شیره‌دار بوه و گلای در دکا : دزانن که هاوین نیزیکه * هر واش
انگو وختیکی بونی او چتانه دبینن بزانن که نیزیکه له بر درکی *
۳۰ راستی به انگو دلّیم : او سلسله قط رانابری هتا او چتانه همو دبن *
۳۲:۳۱ ارض و آسمان رادبرن : بلّا کلامی من قط رانابرن * بلّا له او روژه
یان ساعته کس نازانی : نه ملایکتان ده آسماندا و نه کور بجگه له
باب *

٣٤:٣٣ هوشيار بن : به خبر بن : چونكه نازنن او وعده كنگى يه * و كو
پياويكى سفرى مالى خوى بجى هيشت و بــه خذمتــكارانى خوى
حكماتى دا : به هر يكى كارى خوى : و به دركَـوانى اسپارد كه به
٣٥ خبر بى * دنا به خبر بن چونكه نازنن صاحب مالى كنگى دى : يان
٣٦ ايوارى يان نيوەشوى يان كلّباب خويندنى يان صبحينى زو * نبا كه
٣٧ وختيكى لنكاو بى انگو نوستو ببينى * بلّا اوى كه به انگو دلّيم :
به هموان دلّيم : به خبر بن *

باب ١٤

١ و له پاش دو روژان جيژنى فصح و فطيرى بو : و كاهنانى گوره
و خويندواران حوليان ددا چلون اوى به فيل بگرن و بيــكوژن *
٢ چونكه كتيان : ده جيژنيدا نه : نبا شيواوى لنيو قومى ببى *
٣ و وختيكى او ده بيت‌عنيا ده مالى شمعونى گولــدا بو و كــه
لسر سفرى رونيشتبو ژنيك هات كه شوشيــكى رونى نــاردينى
خالص و زور به قيمتى هبو . شوشكَـى شكاند و به سرى وى دا
٤ رشت * و هينديك ده خوياندا ناقايل بون و كتيان : بو چى ضايى
٥ او رونى بوه ؟ * چونكه ممكن بو كه او رونه به پتر له سَى صد دينار
٦ بفروشرى و به فقيران بدرى . و بولەبوليان لسر اوى كرد * بلّا
يسوع كتى:لي گرين.بو چى اوى عاجز د كن؟ عمليكى چاكى بو من
٧ كردوه * چونكه فقيرانو هميشه دگل خوتان هيه و هر وختيكى كه
٨ بتانوى دتوانن چاكَـى دگليان بكن : بلّا امنو هميشه نيه * اوى كه

٩ توانی کردی . بدنی منی ده پیشدا چور کردوه بو ناشتنی * راستی
به انگو دڵیم : هر جییکی که انجیل وعظ د کری ده همو دنیایــدا
خبریش ددری له اوی که او کردی : بو یادگاری وی *
١٠ و یهودای اسخروطی : یکیك لو دوازدانه : چو کن کاهنانی گوره
١١ که اوی به وان تسلیم بکا * و که اوان بیستیان خوشحال بون و وعده‌یان
کرد که دراو به وی بدن . و حولی ددا چلون اوی به فرصت تسلیم
بکا *
١٢ و ده روژی هولی جیژنی فطیردا که برخی فصحیان د کشتوه :
شاگردان به وییان گت : بو کوی دتوی که بچین و حاضر بکین که
١٣ فصحی بخوی ؟ * و دوانی له شاگردانی خوی نارد و به وانی گت :
برونه شاری و پیاویك توشو دبی که جریك آو هلدگری . وه‌دوای
١٤ وی بکون * و ده هر جییکیدا که بچیته ژوری به صاحب مالی بڵین
که ماموستا دڵی : لکوی یه او منزلی من که لوی دگل شاگردانی
١٥ خوم فصحی بخوم ؟ * و او به انگو نیشان ددا بالاخانیکی گوره
١٦ فرش کراو و حاضر و لوی بو مه حاضر بکن * و شاگردان وه‌در
کوتن و هاتنه نیو شاری و هر وکو او به وانی کتبو پیدایان کرد :
و فصحیان حاضر کرد *
١٨:١٧ و که ایواری بو : دگل او دوازدانه هات * و که اوان رونیشتبون
و دیان‌خوارد یسوع کتی : راستی به انگو دڵیم که یکیك له انگو
١٩ امن تسلیم دکا : اوی که دگل امن دخوا * و دستیان پی کرد که

٢٠ خمناك بىن و به وى بلّين : يك يك : مگر امنم ? * بلا او به وانى
گت : يكيك لو دوازدانه : اوى كه د گل امن دست ده قاپى دخا *
٢١ چونكه هلبته كورى آنسانى دروا چلونيكى بحثى وى نوسراوه :
بلّا واى بو او كسى كه كورى انسانى به سببى وى تسليم د كرى .
بو او كسه چاتر دبو اگر بولد نبوبايه *
٢٢ و كه اوان نانيان دخوارد يسوع نانى هلگرت : ممباركى كرد :
٢٣ لتى كرد و داى به وان و كتى : ورگرن : اوه بدنى منه * و پياليكى
هلگرت : شكرى كرد : داى به وان و هموبان له ويان خواردوه *
٢٤ و به وانى گت : اوه خوينى منه : اى عهدى تازه : كـــه بو زوران
٢٥ درژيندرى * راستى به انگو دلّيم كه ايدى قط ناخوموه له حاصلى
ميوى هتا او روژى كه ده پادشايتى خلّاى دا اوى تازه دخوموه *
٢٦:٢٧ و كه زبوريان خويندبو بو كيوى زيتونى وەدر كوتن * و يسوع
به وانى گت : هموتان له من هلدنگوترين : چونكه نوسراوه : له
٢٨ شوانى ددم و مران بلاو دبن * بلّا له پاش هلستانوى من وەپيش
٢٩ انگو د كوم بو جليلى * و پطروس به وى گت : اگر همو هلبنگوترين
٣٠ بلّا امن نه * و يسوع به وى گت : راستى به تو دلّيم كه اتو اورو داو
شويدا : له پيش اوى دا كه كلّباب دو جار بخوينى : سى جار له من
٣١ حاشا د كى * بلّا او هر زور زياتر كتى : اگر بو من لازم بى كه د گل
اتو بمرم قط له تو حاشا نا كم . و هر واش همو كتيان *
٣٢ و هاتنه جيبكى كه نيوى گتسمانى بو و به شاگردانى خوى گت :

۳۳ رونیشن لیره هتا دعا بکم * و پطروس و یعقوب و یوحنّای د گل
۳٤ خوی هلگرت و دستی پی کرد به ترسان و دلتنگی * و به وانی گت:
۳٥ گیانی من زور خمنا که هتا مردنی : لیره بمینن و به خبر بن * و کمیك
چو پیش و کوته سر ارضی و دعای کرد که اگر ممکن بی او سعاته
۳٦ له سری رابری * و کتی : یا ابّا بابه : همو چت بو تو ممکنه . او
پیالی له من هلگره : امّا نه اوی که امن دموی بلّا اوی که اتو دتوی*
۳۷ و هات و اوانی نوستو پیدا کرد و به پطروسی گت : ای شمعــون
۳۸ نوستوی ؟ اری نت‌دتوانی سعاتیك به خبر بی ؟ * به خبر بن و دعا
بکن هتاکو ده تجربی نکون . هلبته روح راضیه بلّا بدن ضعیفه *
۳۹:٤۰ و دیسان چو و دعای کرد : هر او قصی د گت * و کــه دیسان
گراوه اوانی نوستو پیدا کرد چونکه چــاوی وان گران بون . و
٤۱ نیان‌دزانی چی جواب به وی بدن * و جاری سیم هات و به وانی گت:
اویستا بنون و بحسینوه : بسه : او سعاته هاتوه : اوتا کوری انسانی به
٤۲ دستانی گناحکاران تسلیم د کری * هلستن : با بروین : اوتا اوی
که امن تسلیم د کا نیزیکه *
٤۳ و جی بجی که هیشتا او قصی د کرد یهودا : یکیك لو دوازدانه
هات و غلبایك د گل اوی به شیران و کتکان له لای کاهنانی گوره
٤٤ و خویندواران و پیران * و تسلیمکری وی نیشانیــکی به وان دابو
دیگت : اوی که ماچی د کم او هوه : بیگرن و به هوشیاری بیبن *
٤٥ و که هات جی بجی وه‌پیش کوته کن اوی و کتی : ای ماموستا :

٤٦ و اوی ماچ کرد * و اوان دستانیان هاویشته سر اوی و گرتیان *
٤٧ بلّا یکیك له حاضران شیری هلکیشا و له خذمتکاری کاهنی گوری
دا و گوی وی بری *
٤٨ و یسوع جوابی دا و به وانی گت : وکو بو سر جردیکی وەدر
٤٩ کوتون به شیران و کتکان هتاکو امن بگرن * هر روژ دگل انگو
ده هیکلیدا بوم و تعلیمم ددا و امنو نگرت . بلّا هتاکو کتیبان تواو
٥٠:٥١ ببن : اوه بوه * و همو اویان به جی هیشت و هلاتن * و جحیلیك
وەدوای وی دکوت که چارشیویکی کتانی له بدنی روتی خوی هالاندبو
٥٢ و اویان گرت * بلّا او چارشیوی به جی هیشت و به روتی هلات *
٥٣ و یسوعیان برده کن کاهنی گوره . و همو کاهنانی گوره و پیران
٥٤ و خویندواران خر بونوه * و پطروس له دوروه وەدوای وی کوت
هتا ژور حصاری کاهنی گوره و دگل خذمتکاران رونیشتبو و خوی
٥٥ له بر آوری گرم دکردوه * و کاهنانی گوره و همو مجلیسی
کیخدایان له شایدی له سر یسوع دگران هتاکو بیکوژن و وەدستیان
٥٦ ندکوت * چونکه زوران شایدی به درویان له سر اوی ددا و شایدیان
٥٧ یك نبون * و هیندیك راست بونوه و شایدی به درویان له سر اوی
٥٨ دا دیان گت : * امه بیستمان له اوی که دیگت : امن او هیکلی به
دست درست کراو دروخینم و به سی روژان یکی دیکه به دست
٥٩ درست نکراو درست دکم * و به اوش شایدی وان یك نبو *
٦٠ و کاهنی گوره هلستا نیوەراستی : له یسوع پرسیاری کرد دیگت :

اری هیچ جواب نادی ؟ اوانه له سر اتو چی شـایدی ددن ؟ *
٦١ بلا او بی دنگ بو و هیچ جوابی ندا . دیسان کاهنی گوره لي پرسی
٦٢ و به وی گت : اری اتوی مسیح کوری او ممبارکی ؟ * و یسوع
کتی : امنم : و انگو کوری انسانی دیینن که له لای راستی قوتی
٦٣ رودنیشی و دگل هورانی آسمان دی * بلا کاهنی گوره جلی خوی
٦٤ دری و کتی : ایدی چی احتیاجیمان به شایدان هیه ؟ * کفرو بیستوه
تگبیرو چیه ؟ و اوان همو حکمیان لسر اوی کرد که لایقی مردنی
٦٥ یه * و دستیان پی کرد : هیندیك که تفی لی بکن و که روی وی
داپوشن و مستی لی بدن و به وی بلین : پیغمبرتی بکه ! و فراشان
به زلان اویان ورگرت *
٦٦ و که پطروس له خواری ده حصاریدا بو یکیك له قرهواشانی کاهنی
٦٧ گوره هات * و که پطروسی دی که خوی گرم دکردوه : تماشای وی
٦٨ کرد و کتی : اتوش دگل یسوع ناصری بوی * بلا او حاشای کرد
دیگت : نازانم و نافامم اتو دلي چی . و وهدر کوتـه دری ده
٦٩ دالانیدا * و که قرهواشکه اوی دی : دیسان دستی پی کرد که به
٧٠ حاضران بلی : اوه له وانه * بلا او دیسان حاشای کرد . و له پاش
کمیك دیسان حاضران به پطروسیان گت : به راستی اتو له وانی
٧١ چونکه اتوش جلیلي * بلا او دستی پی کرد که لعنت بکا و سویند
٧٢ بخوا : او پیاوی ناناسم که انگو قصی لی دکن * و جی بجی کلباب
جاری دویم خویندی . و پطروس او قصی وهبیر هاتـوه چلونیکی

یسوع به وی کتبو : له پیش اوی که کلّباب دو جار بخوینی : سَی
جار له من حاشا د کی . و که فکری لی کردوه گریا *

## باب ١٥

١ و جی بجی صبحینی زو کاهنانی گوره د گل پیران و خویندواران
و همو مجلیسی کیخدایان تگبیریان کرد : یسوعیان بست و بردیان
٢ و به پیلاطوسیان تسلیم کرد * و پیلاطوس لي پرسی : اری اتو پادشای
٣ یهودیانی ? بلّا او جوابی به وی دا و کتی : اتو دلّي * و کاهنانی
٤ گوره گلییان زور له وی د کرد * و پیلاطوس دیسان لي پرسی د گت:
٥ اری هیچ جواب نادی ? اوتا چند چتان له تو گلیی د کن * بلّا یسوع
٦ ایدی هیچ جوابی ندا وها که پیلاطوس عجایب ما * بلّا ده جیژنیدا
٧ گرتویکی برلا د کرد : هر کس که طلبیان کردبا * و یکیك هبو :
نیوی براباس که گیرا بو د گل شلوقان که ده شلوقیدا قتلیان کردبو *
٨ و خلکی چونه سری و دستیان پی کرد که طلب بکن که و کو همیشه
٩ بو وانی د کرد : وا بکا * و پیلاطوس به وان جوابی دا دیگت : اری
١٠ دتانـوی که پادشای یهودیان بو انگو برلا بکم ? * چونکه دیزانی
١١ که کاهنانی گوره له بخیلی اویان تسلیم کردبو * بلّا کاهنانی گوره
١٢ خلکییان فیر کرد که براباسی بو وان برلا بکا * و پیلاطوس دیسان
جوابی دا و به وانی گت : دنا چو دوی که د گل اوی بکم که پی
١٣ دلّین پادشای یهودیان ? * بلّا اوان دیسان قیژاندیان : اوی له سیداری

١٤ بده ! * و پیلاطوس به وانی گت : دنا چی خراپیکی کردوه ؟ بڵا
١٥ اوان هر پتر قیژاندیان : اوی له سیداری بده ! * و که پیلاطوس کیفی
لی بو که خلکی راضی بکا : براباسی بو وان برلا کرد . و که له
یسوع قامچی لی دابو تسلیمی کرد که له سیداری بدری *
١٦ و عسکران اویان برده ژور حصاری که دیوانخانه یه و همو فوجیان
١٧ بانگ کرد * و جلیکی سور دەبر اویان کرد و تاجیکیان له دروی
١٨ چنی و له سریان دانا * و دستیان پی کرد که سلاوی لی بکن :
١٩ سلام ای پادشای یهودیان ! * و به قامیشیکی له سری ویان ددا و
٢٠ تفیان لی دکرد و چوکیان داددا و سجدەیان لی دکرد * و که گپیان
پی دابو : جلّه سور که لەبر اویان داکند و جلی خوی دەبریان کرد و
بردیانه دری که له سیداري بدن *
٢١ و ری‌بواریکی که له زویی دهات : شمعون کورینی : بابی اسکندر
٢٢ و روفوسیان مجبور کرد که سیداری وی هلگری * و اویان برده
٢٣ جییکی : نیوی گولگوتا : که ترجمه دکری به جیی کاسی سر * و
٢٤ شراپ تیکل به مُریان به وی دا : بڵا او قبولی نکرد * و اویان له
سیداری دا و جلی ویان بش کرد که پشکیان لی داویشت که هر
٢٥ یکه چی ورگری * بڵا سعاتی سیم بو و اویان له سیداری دا *
٢٦ و سرنامی خطای وی وا نوسرا بو : پادشای یهودیان * و دگل اوی
دو جردەیان له سیداری دا : یکیك له لای راستی و یکیك له لای
٢٨ چپی * و ری‌بواران کفریان پی دکرد و سری خویان رادواشاند و

٢٩ دیان گت*ها ای خراپکری هیکلی و درستکری وی ده سَی روژاندا!*
٣٠:٣١ خوت خلاص بکه و وره خواری له سیداری * و هر واش کاهنانی
گوره د گل خویندواران دنیو خویاندا گپیان پی ددا و کتـیان :
٣٢ ایدیکانی خلاص کردوه : خوی ناتوانی خلاص بکا * مسیح پادشای
اسرائیل : با اویستا بیته خواری له سیداری هتا کو ببینین و ایمان بینین .
و اوانش که د گل اوی له سیداری درا بون خراپیان به وی د گت *
٣٣ و که سعاتی ششم داهات : تاریکای لسر همو ارضی بو هتا سعاتی
٣٤ نویم * و ده سعاتی نویم دا یسوع به دنگیکی بلند قیژاندی : ایلوی
ایلوی لما سبختنی ! که ترجمه د کری یا خلّای من خلّای من : بو
٣٥ چی امنت بجی هیشتوه ؟ * و هیندیك له حاضران وختیکی بیستیان
٣٦ کتیان : اوتا : او الیاسی بانگ د کا * و یکیك لنگی دا و هوریکی له
سر که پر کرد و لسر قامیشیکی دانا و دای به وی که بخواتوه دیگت:
٣٧ لي گرین ! با ببینین اگر الیاس بی که اوی بهینیته خواری * و یسوع
٣٨ به دنگیکی بلند قیژاندی و روحی تسلیم کرد * و پردی هیکلی دو
٣٩ لت بو له سررا هتا خواری * و که یوزباشی که برامبری وی راوستابو
دیتی که وها روحی تسلیم کرد کتی : به راستی او پیاوه کوری خلّای
٤٠ بو * و چند ژنانیش هبون که له دوروه تماشایان د کرد : که لنیو اوان
مریم مگدلیش بو و مریم دایکی یعقوبی چکوله و یوسی و سالومه *
اوانی که وەدوای وی د کوتن و خذمتیان د کرد وختیکی ده جلیلیدا
بو : و زوراني دیکه که د گل اوی وەسر کوتبونه اورشلیمی *

٤٢ و که ایوار داهات : چونکه روژی تدارك بو که له پیش شموی یه *
٤٣ یوسف اوی که له اریماتیـّه : مشیریکی ماقول هات که بو خوشی
چاوه‌نوری پادشایتی خلّای بو و جُراتی کرد : چو کن پیلاطوس و
٤٤ میتی یسوعی طلب کرد * و پیلاطوس عجایب ما اگر الان مرد بی :
و یوزباشي بانگ کرد و پرسیاری لی کرد اگر له میژ بو مردبو *
٤٥:٤٦ و که له یوزباشی زانی : میتی به یوسفی بخشی * و کتانی کری و
اوی هینا خواری و باو کتانی پیچایوه و ده قبریکی نا که ده شاخیدا
٤٧ هلقندرا بو و بردیکیان لسر درکی قبری خلور کردوه * و مریم
مگدلی و مریم دایکی یوسی تماشایان د کرد لکوی داندرا *

باب ١٦

١ و که شمو رابردبو مریم مگدلی و مریم دایکی یعقوب و سالومه
٢ عطرانیان کری هتا کو بین و چوری بکن * و زور زو ده روژی هولی
٣ حوتویدا هاتنه سر قبری وختیکی روژ هلات * و به یکتریان د گت :
٤ کی او بردی له درکی قبری بو مه خلور د کاتوه ؟ * و که تماشایان
٥ کرد دیتیان که برد که خلور ببووه : چونکه زور گوره بو * و که چونه
نیو قبری دیتیان جحیلیك له لای راستی رونیشتبو به عبایکی سپی
٦ ده‌بر کراو و زور ترسان * بلّا او به وانی گت : مترسین : انگو له
یسوع ناصری له سیداره دراو د گـَرین . هلستاوتوه : لیره نیه : اوتا
٧ او جیی که اویان لی دانا * بلّا برون و به شاگردانی وی و به پطروس
بلّین که وه‌پیشو د کوی بو جلیلی : لوی اوی دبینن چلونیکی به انگوی

٨ گت : و وەدر کوتن و له قبری هلاتن چونکه لرز و سـام اوانی
گرتبو : و به هیچ کسیان چتیك نگت چونکه دترسان *
٩ و که هلستابو زو ده روژی هولی حوتویدا : هولی بو مریم مگدلی
١٠ بیندرا : اوی که حوت جنّـانی لی در کردبو * او چو و خبری به وان
١١ دا که دگل اوی ببون : که شینییان دکرد و دگریان * و که اوانه
١٢ بیستیان که زندوه و له وی دیترابو : باوریان نکرد * و له پاش اوی
به شکلیکی دیکه بیندرا بو دو له وان وختیکی دگَـران و بو دیهاتی
١٣ دچون * و اوانه چون و خبریان به وانی دیکه دا : بلّا اوان به وانیشیان
١٤ باور نکرد * و له پاشان بو او یازدانه بو خویان بیندرا وختیکی لسر
سفری رونیشتبون : و سر کونی بی باوری و دلرقی وانی کرد چونکه
١٥ به اوانی که اوی هلستاو دیبویان باوریان نکرد * و به وانی گت :
١٦ برون ده همو دنیایدا و انجیلی بو همو مخلوقی وعظ بکن * اوی که
ایمان بینی و تعمید بکری خلاص دبی : بلّا اوی که ایمان نینی حکم
١٧ لسری دکری * و او نیشانانه دگل ایمان هینران دبن : به نیوی
١٨ من جنّـان در دکن و به زمانانی تازه قصان دکن * ماران هلدگرن :
و اگر چتیکی کشنده بخونوه ضرر بو وان ناگا . دستان لسر نخوشان
١٩ دادنین و صاغ دبنوه * دنا له پاش اوی که رب یسوع قصی دگل اوان
کردبو بو آسمانی هلکیشرا و له لای راستی خـلّای رونیشت *
٢٠ بلّا اوان وەدر کوتن و ده همو جییکیدا وعظیان دکرد : و رب کومگی
وانی دکرد و کلامی اثبات دکرد باو نیشانانی که دگلیان دبون *

# انجیل لوقا

## باب ۱

۱ چونکه زوران دستیان دریژ کردوه به ریز دانانی حکایتیکی بحثی
۲ او چتانی که لنیو مه تواو بون * چلونیکی اوانی که له هولوه تماشا کران
۳ و خذمتکارانی کلامی بون به مه تسلیمیان کردوه * امنیش که له
هولوه هموم به وردی سوارغ کردوه : مصلحتم دیوه که به قاعده بو تو
۴ بنوسم ای تیوفیلوسی محتبر * هتا کو یقینی او کلامی که ده ویدا فیر
بوی چاك بزانی *
۵ ده روژانی هیرودیس پادشای یهودیه دا : کهانیك نیوی زکریّا
له دستەی ابیّا هبو و او ژنیکی بو له کچانی هارون و نیوی الیصابت
۶ بو * و هر دوك ده حضوری خلّایدا صادق بون و ده همو حکمان و
۷ شریعتانی رب دا به بی عیبی به ری دچون * و اوان اولادیان نبو
چونکه الیصابت نزوك بو : و هر دوك ده روژانی خویاندا پیر بون *
۸ و بو که ده نوبی دستەی خویدا له حضوری خلّای کاهنیتی خوی د کرد*
۹ و کو عادتی کاهنیتی پشکی لسر کوت که وەژور هیکلی رب بکوی
۱۰ و بخور بسوتینی * و همو جماعتی قومی ده سعاتی بخوریدا له دری
۱۱ بون و نویژیان د کرد * و ملایکتی رب له لای راستی مذبحی بخوری
۱۲ راوستاو بو وی بیندرا * و زکریّا وختیکی اوی دی تیك چو و ترس

١٣ کوته سری * بلّا ملایکت به وی گت : مترسه ای زکریّا : چونکه
دعای تو قبول کراوه و ژنی تو الیصابت کوریکی بو تو دزی و نیوی
١٤ وی یوحنّا بانگ دکری * و بو تو خوشحالی و شادیتی دبی و زوران
١٥ لبر بولد بونی وی کیفخوش دبن * چونکه ده حضوری رب دا گوره
دبی و شراپ و مستکران قط ناخواتوه : و له زگی دایکی خوشیوه
١٦ پر له روح‌القدوس دبی * و زوران له بنی اسرائیل بو لای رب خلّای
١٧ خویان وردگیری * و او وه‌پیش اوی دکوی به روح و قوتی الیاس
که دلّی بابان بو لای مندالان و بی اطاعتان بو عقلداری صادقان
١٨ وردگیری : که قومیکی حاضر بو رب ریك بخا * و زکریّا به
ملایکتی گت : اوی به چی بزانم چونکه امن پیرم و ژنی من ده
١٩ روژانی خویدا پیر بوه ؟ * ملایکت جوابی دا و به وی گت : امن
جبرائیلم که له حضوری خلّای رادوستم و ناردراوم که دگل اتو
٢٠ قصان بکم و اوانه به تو مزگینی بدم * و اوتا : لالّ دبی و نتوانی
قصان بکی هتا او روژی که اوانه دبن : لبر اوی که به قصانی من که
٢١ ده وختی خویاندا تواو دبن باورت نکرد * و قومی چاوه‌نوری زکریّا
٢٢ بون و له معطل بونی وی ده هیکلیدا عجایب دمان * بلّا وختیکی هاته
دری نیدتوانی دگل اوان قصان بکا : و تی گیشتن که ده هیکلیدا
٢٣ دیتویکی دیبو : و او بو وان اشارتی دکرد و بی دنگ ما * و بو که
٢٤ وختیکی روژانی خذمتی وی تواو بون چو مالی خوی * و له پاش
او روژانه ژنی وی الیصابت آوس بو و پینج مانگ خوی دشاردوه

٢٥ و دیگت * وها رب د گل امنی کردوه داو روژاندا که تماشای کرد
که ابروی من لنیو خلکی ملگری *
٢٦ و ده مانگی ششمدا : جبرائیل ملایکت له لای خلّای ناردرا بو
٢٧ شاریکی جلیلی : نیوی ناصرت * بو کن بیکریکی که دزگیران بو
به پیاویکی : نیوی یوسف له مالی داود و نیوی او بیکری مریم بو *
٢٨ و که ملایکت هاته ژوری کن اوی کتی : سلام علیکی ای رحم پی
٢٩ کراو : رب د گلته * بلّا لسر او قصه زور شیوا و فکری د کردوه که او
٣٠ سلاوه چی جوریکه * و ملایکت به وی گت : مترسه ای مریم :
٣١ چونکه لکن خلّای رحمت پیدا کردوه * و اوتـا : آوس دبي ده
٣٢ مندالدانتدا و کوریکی دزي و نیوی وی یسوع بانگ دکی * او
گوره دبی و کوری تعالی بانگ د کری : و رب خلّا تختی داود
٣٣ بابی وی به وی ددا * و لسر مالی یعقوب هتا ابد پادشایتی د کا و
٣٤ پادشایتی وی آخری نابی * بلّا مریم به ملایکتی گت : اوه چلون
٣٥ دبی چونکه پیاو ناناسم * و ملایکت جوابی دا و بـه وی گت :
روح‌القدوس لسر اتو دی و قوتی تعالی سیبری لسر اتو داوی : لبر
٣٦ اوش او مقدسَی که بولد دبی : کوری خلّای بانگ د کری * و اوتا
الیصابت خذمی تو اویش ده پیریتی خویدا به کوریکی آوس بوه
٣٧ و اوه مانگی ششمه بو وی که نزوك بانگ د کرا * چونکه لکن خلّای
٣٨ هیچ چتیك ناممکن نابی * و مریم کتی : اوتا قرەواشی رب : و کو
قصی تو وا د گل امن ببی . و ملایکت له کن اوی روی *

٣٩ و مریم داو روژاندا هلستا و به تالوکه چو کویستانی بو شاریکی
٤٠ یهودیه * و وەژور مالی زکریّای کوت و له الیصابت سلاوی کرد *
٤١ و بو که وختیکی الیصابت سلاوی مریمی بیست طفلکه ده مندالدانی
٤٢ ویدا خوی هلاوت و الیصابت له روح‌القدوس پر بو * و به دنگیکی
بلند بانگی کرد و کتی: ممبارکی لنیو ژنان و ممبارکه میوی مندالدانی
٤٣ تو ! * و اوه بو من له کوی بو که دایکی ربّی من بو کن امن بی *
٤٤ چونکه اوتا وختیکی دنگی سلاوی تو بو گویانی من گیشت طفلکه
٤٥ ده مندالدانی مندا به خوشحالی خوی هلاوت * و خوزگه به اوی که
٤٦ باوری کرد که او چتانی که له رب به وی کتراون تواو دبن * و مریم
٤٧ کتی : گیانی من تعریفی رب دکا * و روحی من له خلّای خلاصکرم
٤٨ خوشحال بوه * چونکه له سوکی قرەواشی خوی تماشای کردوه :
٤٩ چونکه اوتا له وی پاش همو سلسلان امن ممبارك دخوینن * چونکه
٥٠ او صاحب قوته چتانی گوری به من کردوه و نیوی وی مقدسه * و
٥١ رحمی وی له سلسله بو سلسله یه لسر اوانی که له وی دترسن * به
باسکی خوی قوتی کردوه و تشخوصانی ده فکری دلّی خویاندا بلاو
٥٢ کردوه * صاحب قوتانی له تختان فری داوته خواری و نویانی بلند
٥٣ کردوه * برسیانی به چتانی چاك تیر کردوه : و دولامندانی به بطالی
٥٤ به ری کردوه * عبدی خوی اسرائیلی کومگ کردوه بو یادگاری
٥٥ رحمی * چلونیکی به بابانی مه خبری داوه : به ابراهیم و به توی وی
هتا ابد الابد *

٥٧:٥٦ و مریم به قدسَی مانگٓ لکن اوی ما و بو مالی خوی گراوه * بلّا
٥٨ وعدی الیصابت تواو بو که بزی و کوریکی زا * و جیرانان و خذمانی
وی بیستیان که رب رحمی خوی به وی زیاد کردبو و کیفخوشیان
٥٩ دگل اوی دکرد * و بو که ده روژی هشتمدا هاتن که مندالکی
٦٠ سنّت بکن و اویان به نیوی بابی خوی زکریّا بانگٓ دکرد* و دایکی
٦١ وی جوابی دا و کتی : نه : بلّا دبی یوحنّا بانگٓ بکری * و به
ویان گت : لنیو خذمانی تو کس نیه که به او نیوی بانگٓ کراوه *
٦٢ و بو بابی وی اشارتیان کرد که چی دیویست که او بانگٓ بکری *
٦٣ و تختولیکی طلب کرد و نوسی دیگت : یوحنّا یه نبوی وی . و
٦٤ همویان عجایب مان * و جی بجی زاری وی کراوه و زمانیشی : و
٦٥ قصی دکرد و شکری خلّای دکرد * و ترس هاته سر همو جیرانی
وان : و همو او قصانه ده تواوی کویستانی یهودیه دا دکتران *
٦٦ و همویان که بیستیان ده دلّی خویان دانا دیان گت : اری او منداله
٦٧ چی دبی ? چونکه دستی دبّیش دگل اوی بو * و زکریّا بابی وی
پر له روح‌القدوس بو و پیغمبریتی کرد دیگت *
٦٨ ممبارکٓ بی رب خلّای اسرائیل : چونکه تماشای کردوه و فدیی
٦٩ بو قومی خوی کردوه * و شاخیکی خلاصی بو مه ده مالی داود عبدی
٧٠ خویدا هل‌استاندوه * چلونیکی به زاری پیغمبرانی مقدسی خوی له
٧١ هولوه قصی کردوه * خلاصی له دژمنانی مه و له دستی همو اوانی که
٧٢ امه دبغضینن * هتاکو رحمی دگل بابانی مه بکا و عهدی مقدسی

٧٣ خوی وەبیر بینی * یعنی او سویندی که بو ابراهیمی بابی مَی خوارد:
٧٤ که به مه بدا * که له دستی دژمنان خلاص ببین و بی ترس خذمتی
٧٥ وی بکین * به پاکی و صداقتی له حضوری وی همو روژانی خومان *
٧٦ و اتوش ای مندال : پیغمبری تعالی بانگ دکری : چونکه له حضوری
٧٧ رب وەپیش دکوی هتاکو ریی وی حاضر بکی * هتاکو زانینی
٧٨ خلاصی به قومی وی بدی به بخشینی گناحانی خویان * به سببی دلی
پر رحمی خلای مه : که به دستی وی روژ هلاتن له برەژوری توشی
٧٩ مه بوه * هتاکو به اوانی که ده تاریکای و سیبری مردنیدا رودانیشن
روناکای بدا و پیانی مه ده ریی سلامیدا راست بکا *
٨٠ بلا او منداله گوره دبو و ده روحدا به قوت دبو و هتا روژی نیشان
دانی وی بو اسرائیل ده چولیاندا بو *

باب ٢

١ و بو که داو روژاندا حکمیکی وەدر کوت له اوغسطس قیصر
٢ که همو دنیایی نیونوس بکری * او نیونوسینی هولی بو وختیکی
٣ کیرینیوس حاکمی سوریه بو * و همو دچون که نیونوس بکرین :
٤ هر کس بو شاری خوی * و یوسفیش وەسر کوت له جلیلی له شاری
ناصرتی بو یهودیه بو شاری داود که بیت‌لحم بانگ دکری : چونکه
٥ او له مالی و اوجاغی داود بو * که نیونوس بکری دگل مریم
٦ دزگیرانی خوی که آوس بو * و بو که وختیکی اوان لوی بون

۷ روژان تواو بون که بزی * و کوری هولی خوی زا و اوی پیچاوه و
ده آخوریکی نا چونکه بو وان ده کاروانسرا دا جی نبو *
۸ و داو نیزیکانه دا شوانان هبون که ده دشتیدا بون و شوی کشکی
۹ میگلی خویان دکیشا * و ملایکتی رب لنکاو لکنیان پیدا بو و جلالی
۱۰ رب له دوری وان شوقی دا و به ترسیکی زور ترسان * و ملایکت
به وانی گت : مترسین ! چونکه اوتا خوشحالییکی گوره به انگــو
۱۱ مزگینی ددم که بو همو قومی دبی * چونکه اورو بو انگو خلاصکریك
۱۲ بولد بوه : که رب مسیحه ده شاری داود دا * و نیشانی بو انگو اویه :
۱۳ طفلیکی پیچراو و ده آخوریکی دا داندراو پیدا دکن * و لنــکاو
غالبایك له لشکری آسمانی دگل ملایکت پیدا بون کــه شکری
۱٤ خلایانْ دکرد و دیان گت * جلال بو خلای ده بلنداندا و لسر ارضی
۱۵ سلام و لنیو خلکی رضامندی ببی * و بو که وختیکی ملایکتان له کن
اوانی بو آسمانی چون : شوانان به یکتریان گت : اویستا با بچین
هتا بیت‌لحمی و او چتی که بوه و که رب به مه نیشان داوه ببینین *
۱٦ و به تالو که هاتن و مریم و یوسف و او طفلی ده آخوری دا داندراو
۱۷ پیدایان کرد * و که دیتیان خبریان دا لو قصی که بحثی او مندالی به
۱۸ وان کترا بو * و همو اوانی که بیستیان عجایب دمان له سر او چتانی
۱۹ که له شوانان به وان کتران * بلا مریم همو او قصانی راد گرت و ده
۲۰ دلی خویدا فکری دکردوه * و شوانان گرانوه به حمدوسنا و شکری

خلّای کردن بو همو چتانی که دیبویان و بیستبویان : چلونیکی به
وان کترا بو *
٢١ و که هشت روژان بو سنّت کردنی وی تواو بون : نیوی وی
یسوع بانگ کرا چلونیکی له ملایکت بانگ کرا بو له پیش اوی
که او ده مندالدان دا داندرا *
٢٢ و که روژانی پاك کردنی وان موافقی شریعتی موسی تواو بون :
٢٣ اویان برده سر بو اورشلیمی هتا کو بو رب رای بگرن * : چلونیکی ده
شریعتی رب دا نوسراوه که هر نیرینیکی که مندالدان بکاتوه :
٢٤ مقدس بو رب بانگ دکری * و که قربانی بدن وکو ده شریعتی
رب دا کتراوه : جوتیکی کُرکُران یان دو جوجیلانی کوتر *
٢٥ و اوتا ده اورشلیمیدا پیاویك هبو : نیوی شمعون : و او پیاوه صادق و
خلّاترس بو و چاوه‌نوری دلّخوشی اسرائیل بو : و روح‌القدوس لسر
٢٦ اوی بو * و له روح‌القدوس به وی خبر درا بو که مردنی نابینی
٢٧ هتا مسیح ای رب نبینی * و به روح بو هیکلی هات و وختیکی والدین
مندالکه یسوع‌یان هینا ژوری که وکو عادتی شریعتی بو وی بکن *
٢٨ اویش اوی ده باوشی گرت و شکری خلّای کرد و کتی *
٢٩ اویستا یا رب عبدی خوت مرخص دکی به سلامی موافقی قصی خوت *
٣٠:٣١ چونکه چاوانی من خلاصی تویان دیوه * که ده پیش روی همو
٣٢ ملّتان دا حاضرت کردوه * نوریکی بو روناك کردنی طایفان و جلالی
قومی خوت اسرائیل *

۳۳ و باب و دایکی وی عجایب دمان له سر او چتانی که بحثی وی
۳٤ د کتران * و شمعون اوانی ممبارك کرد و به مریم دایکی وی گت :
اوتا : اوه داندراوه بو کوتن و هلستانی زوران ده اسرائیلدا : و بو
۳۵ نیشانیکی که ضد د کتری * : بلّا ده گیانی توش دا شیریك دچقیتوه :
هتا کو فکرانی زور دلّان اشکرا دبن *
۳٦ پیغمبریك هبو حنّا کچی فنوئیل له علی اشیر . او روژانی زوری
رابواردبو . حوت سال له بیکریتی خوی د گل میردی به سری بردبو *
۳۷ و اویستا بیوه‌ژنیك به قد هشتا و چوار سال بو که له هیکلی جوی ندبو
۳۸ بلّا شو و روژ به روژوان و دعایان خذمتی د کرد * و او داو سعاتیدا
هات : شکری خلّای کرد و بحثی وی بو همو چاوه‌نورانی خلاصی
۳۹ ده اورشلیمیدا قصی د کرد * و که همو چتانی موافقی شریعتی رب
٤۰ تواویان کردبو بو جلیلی بو ناصرتی : شاری خویان گرانوه * بلّا
مندالکه زیادی د کرد و به قوت دبو و به عقل پر دبو و رضای خلّای
لسر اوی بو *
٤۱ و والدینی وی همو سال بو اورشلیمی بو جیژنی فصحی دچون *
٤۲ و که دوازده سالانه بو : و کو عادتی جیژنی : بو اورشلیمی وه‌سر
٤۳ کوتن * و که او روژانه‌یان تواو کردبو : ده گَرانَوی خویا ندا :
٤٤ مندالکه یسوع ده اورشلیمیدا ما و والدینی وی نیان‌دزانی * بلّا که
فکریان د کرد که او ده کاروان دایه ریی روژیکی هاتن و لنیو خذمان
٤۵ و آشنایان بو و حولیان ددا * و که پیدایان نکرد : بو اورشلیمی

۴۶ گرانوه و حولیان بو وی ددا * و بو که له پاش سَی روژان اویان ده
هیکلیدا پیدا کرد لنیو ماموستایان رونیشتو و گوی له وان دگرت و
۴۷ پرسیاری له وان دکرد * و همو اوانی که گویان لی دگرت : له
۴۸ عقل و جوابانی وی عجایب دمان * و که اویان دی تعجوب مان :
و دایکی وی به وی گت : ای روله : بو چی دگل امه وات کردوه ؟
۴۹ اوتا بابت و امن به خمناکی بو تو حولمان داوه * و به وانی گت :
بو چی بو من حولو دا ؟ اری نتان‌دزانی که بو من لازمه که ده مالی
۵۰ بابی خوم دا ببم ؟ * و اوان تی نگیشتن او قصی که به وانی گت *
۵۱ و چو خواری دگل اوان و هاته ناصرتی و اطاعتی وانی کرد . و
۵۲ دایکی وی همو او قصانی ده دلّی خویـدا رادگرت * و یسوع ده
عقلداری و بـژن و رضامندیدا لکن خلّای و خلکی ترقّی دکرد *

## باب ۳

۱ بلّا ده سالی پازدیمی حکومتی طیباریوس قیصردا : وختیـکی
پنطیوس پیلاطوس حاکمی یهودیه بو و هیرودیس تیترارکی جلیلی
بو و برای وی فیلپوس تیترارکی ایطوریه و ولاتی تراخونیتس و
۲ لیسانیوس تیترارکی ابیلینی بو * ده وختی کاهنیتی گوری حنّا و
۳ قیافا دا : کلامی خلّای هات لسر یوحنّا کوری زکریّا ده چولیدا * و
هات ده همو ولاتی دوری اردن دا و تعمیدی توبی بو بخشینی گناحان
۴ وعظ دکرد * چلونیکی نوسراوه ده کتیبی قصانی اشعیّا پیغمبر دا :

دنگی بانگگریکی ده چولیدا دڵی : ریی رب حاضر بکن و جادانی
٥ وی راست بکن * همو دول پر دکری و همو کیو و طپولکه نوی
٦ دکری و خواران راست دبن و کندو کلویان بو رییانی صاف * و همو
کس خلاصی خڵای دبینی *
٧ او دمی به جماعتانی که وەدر دکوتن کە له اوی تعمید بکرین
کتی : ای اولادی ماران : کی به انگوی نیشان دا که هلبین له او
٨ غضبی که دی ؟ * دنا میوی لایقی توبی بینن ! و دست پی مکن
که ده خوتاندا بڵین : امه ابراهیمان هیه بو باب : چونکه به انگو
دڵیم : که خڵا دتوانی له او بردانه مندالان بو ابراهیمی هلبستینی *
٩ و الانیش بیور لکن رگی داران داندراوه . دنا هر داریکی که میوی
١٠ چاك ناینی دبردری و ده آوری داویژری * و جماعتان له وییان پرسی
١١ دیان گت : دنا چی بکین ؟ * بڵا جوابی دا و به وانی گت : اوی که
دو کراسی هیه با بشی بکا دگل اوی که نیتی : و اوی که خوراکی
١٢ هیه با واش بکا * و رادارانیش هاتن که تعمید بکرین : و به وییان
١٣ گت : ای ماموستا : چی بکین ؟ * و به وانی گت : پتر له اوی که
١٤ بو انگو قرار کراوه مستینن * و عسکرانیش له وییان پرسی دیان گت:
امَش چی بکین ؟ و به وانی گت : ظلمی له کس مکن و شلتاغ
مکن و به مواجبی خوتان راضی بن *
١٥ و که قوم چاوەنور دبون و هموان ده دڵی خویاندا درحقی یوحنّا
١٦ فکریان دکردوه اگر او مسیح بی : یان نه : * یوحنّا جوابی دا و به

هموانی گت : امن انگو به آوی تعمید دکم بلاّ اوی که له من به
قوت‌تره دی که امن لایق نیم که بندی کوشی وی بکموه . او انگو
١٧ به روح‌القدوس و آور تعمید دکا * که بیژنگی ده دستی خوی دایه
هتا کو جوخینی خوی پاك بکا و گنمی ده امباری خویدا خر بکا : بلاّ
کا که دسوتینی به آوریکی که نا کوژیتوه *
١٨ و به زور چتانی دیکش نصیحتی ددا و بو قومی وعظ دکرد *
١٩ بلاّ هیرودیس تیترارك که له وی زم کرا بو لبر هیرودیا ژنی برای
٢٠ خوی و لبر همو خراپی که هیرودیس کردبوی * اویشی لسر همو
زیاد کرد که یوحنـّای ده بندیخانیدا حبس کرد *
٢١ و بو که وختیکی همو قوم تعمید کران : یسوع‌یش تعمید کرا .
٢٢ و که دعای دکرد آسمان اواله بووه * و روح‌القدوس به شکلیکی
جسمانی وکو کوتریك هاته خواری سر اوی و دنگیك له آسمانی
هات : اتو کوری خوشوستی منی : له تو خوشحالم *
٢٣ و یسوع بو خوی به قد سی سال بو وختیکی دستی پی کرد : و
٢٤ وکو فکر دکرا کوری یوسف بو : او ای هیلي * او ای متـّاتی : او ای
٢٥ لیوي : او ای ملکي : او ای ینـّای : او ای یوسفی * او ای متـّاتیای :
٢٦ او ای آموسی : او ای ناحومی : او ای حسلي : او ای نگـّاي * او ای
ماتی : او ای متـّاتیای : او ای شمعي : او ای یوسکی : او ای یودای *
٢٧ او ای یوحنـّای : او ای ریسای : او ای زروبابلی : او ای شالتیئیلی :
٢٨ او ای نیري * او ای ملکي : او ای ادي : او ای قوسامی : او ای

٢٩ المادامی : او ای عیری * او ای یسوی : او ای الیعازری : او ای
٣٠ یوریمی : او ای متّاتی : او ای لیوي * او ای شمعونی : او ای یهودای:
٣١ او ای یوسفی : او ای یونامی : او ای الیاقیمی * او ای میلیای : او ای
٣٢ مینّای : او ای متّاتای : او ای ناتامی : او ای داودی * او ای یسّاي:
او ای یوبیدی : او ای بوعزی : او ای شالحی : او ای نحشّونی *
٣٣ او ای عمینادابی: او ای ادمینی: او ای آرني: او ای حصرومی:او ای
٣٤ فارصی : او ای یهودای*او ای یعقوبی: او ای اسحقی: او ای ابراهیمی:
٣٥ او ای تاراحی : او ای ناحوری * او ای سروگی : او ای رعوی :
٣٦ او ای فالگی : او ای عیبری : او ای شالحی * او ای قینامی : او ای
٣٧ ارفکشادی : او ای سامی : او ای نوحی : او ای لامکی * او ای
متوشالحی : او ای حنوخی : او ای یاردی : او ای مهللئیلی : او ای
٣٨ قینامی * او ای انوشي : او ای شیتي : او ای آدمي : او ای خلّای *

## باب ٤

١ بلّا یسوع پر له روح‌القدوس له اردنی گـَراوه و به روح ده چولیدا
٢ بردرا * و چل روژان له شیطان تجربه دکرا ۰ و داو روژاندا چتیکی
٣ نخوارد . و که اوان خلاص بون برسی بو * و شیطان به وی گت :
٤ اگر اتو کوری خلّاي : بلّي به او بردی که ببی به نان * و یسوع به وی
جوابی دا : نوسراوه که انسان نه تنیا به نان دژی بلّا به هر قصیکی
٥ خلّای * و که اوی برده سر کیویکی بلند همو پادشایتانی دنیایی به

٦ لحظیکی به وی نیشان دا * و شیطان به وی گت : همو او حکماتی
و جلالی اوانه به تو ددم : چونکه به من تسلیم بوه و به هر کسیکی
٧ که دموی دی‌دم * دنا اگر اتو لپیش امن سجدی بکی : همو ایتو
٨ دبی * و یسوع جوابی دا و به وی گت : نوسراوه : دبی رب خلّای
٩ خوت سجدی بکی و تنیا به وی عبادت بکی * و اوی بو اورشلیمی
برد و لسر قوبّی هیکلی دانا و به وی گت : اگر اتو کوری خلّای :
١٠ خوت له ایره باویژه خواری * چونکه نوسراوه که به ملایکتانی خوی
١١ درحقی تو امر دکا که رات‌بگرن * و اتو لسر دستان هلدگرن :
١٢ نبا پیی تو وه‌بردیکی بکوی * و یسوع جوابی دا و به وی گت :
١٣ کتراوه : رب خلّای خوت تجربه مکه * و که شیطان همو تجربی
خلاص کرد بو : هتا وختیکی له کن اوی لا چو *
١٤ و یسوع به قوتی روح بو جلیلی گراوه . و خبر بحثی وی ده همو
١٥ ولاتی دورندور وه‌در کوت * و او ده کنشتانی واندا تعلیمی ددا و له
هموان تعریف دکرا *
١٦ و هاته ناصرتی لکوی که گوره ببو و وکو عادتی خوی ده روژی
١٧ شمویدا وه‌ژور کنشتی کوت و هلستا که بخوینی * و کتیبی اشعیّا
پیغمبر به وی درا : و که او کتیبی اواله کرد او جیی پیدا کرد که
١٨ لوی نوسرابو * روحی رب لسر امنه : چونکه امنی مسیح کردوه که
مزگینی به فقیران بدم . امنی ناردوه که به دلشکاوان شفا بدم : که
ازادی بو یخسیران و دیتنی بو کویران وعظ بکم : که ظلم لی کراوان

١٩ ده ازادی بنیرم * و که سالی مقبولی رب وعظ بکم *
٢٠ و کتیبکَی پیچاوه : دای به خذمتکاری و رونیشت : و چاوی
٢١ هموان ده کنشتیدا لسر اوی دروا بون * و دستی پی کرد که به وان
٢٢ بلّی : اورو او نوسینی ده گویانو دا تواو بوه * و هموان شایدی بو ویان
دوا و له قصانی رحم که له زاری وی وەدر دکوتن عجایب دمان
٢٣ و کتیان : اری اوه کوری یوسف نیه ? * و به وانی گت : هلبته
انگو او مثلی به من دلّین : ای حکیم : خوت صاغ بکەوه . هر چی
که بیستومانه که ده کفرناحومیدا بوه لیرش ده وطنی خوت بکه *
٢٤ و کتی : راستی به انگو دلّیم که هیچ پیغمبر ده وطنی خویدا مقبول
٢٥ نیه * بلّا به راستی به انگو دلّیم : زور بیوەژنان ده اسرائیلدا هبون ده
روژانی الیاسدا وختیکی آسمان سَی سال و شش مانگ بسترا وها
٢٦ که قاطییکی گوره لسر همو ارضی پیدا بو * و الیاس بو کن هیچیان
٢٧ ناردرا بجگه بو کن بیوەژنیکی ده صرفتی صیدونیدا * و زور گولان
ده اسرائیلدا هبون ده وختی الیشع پیغمبردا و هیچیك له وان پاك
٢٨ نکرا بجگه له نعمان سُریانی * و هموان ده کنشتیدا : وختیکی
٢٩ اوانەیان بیست : پر له رق بون * و هلستان : اویان له شاری وەدر خست
و هتا قراغی او کیوی که شاری وان لسری درست کرا بو : اویان
٣٠ برد هتا کو بیاویژنه خواری * بلّا او له نیو وان رابرد و روی *
٣١ و هاته خواری بو کفرناحومی : شاریکی جلیلی . و ده شمویاندا
٣٢ اوانی تعلیم دوا * و له تعلیمی وی مات بون چونکه قصی وی به

٣٣ حكمات بو * و ده كنشتیدا پیاویك هبو كه روحی جنّی پیسی بو :
٣٤ و به دنگیكی بلند قیژاندی* اخ چمان د گل تو هیه:ای یسوع ناصری:
اری هاتوی كه امـَی هلاك بكی ? اتو دناسم كه كیی : ای مقدسی
٣٥ خلّای * و یسوع هرشی لی كرد دیگت : بی دنگ به و له وی وه‌در
بكوه ! و جن اوی ده نیویدا خست و له وی وه‌در كوت به بی ضرر
٣٦ لي دانی * و تعجوبی كوته سر هموان و د گل یكتری قصه‌یان د كرد
دیان گت : اوه چی قصیكه ? چونكه به حكمات و قوت لسر روحانی
٣٧ پیس امر د كا و دینه دری * و خبر بحثی وی ده همو جیبی ولاتی
دورندور وه‌در كوت *
٣٨ و له كنشتی هلستا و وه‌ژور مالی شمعونی كـوت . بلّا خسوی
٣٩ شمعون به نوبتیكی گران كوتبو : و تكایان له وی بو وی كرد * و
لسر اوی راوستا و هرشی له نوبتی كرد و بری دا و جی بجی هلستا
و خذمتی وانی كرد *
٤٠ و كه روژ آوا دبو همو اوانی كه نخوشانیان هبو به دردانی جوی
جوی اوانیان هینا كن اوی و دستانی لسر هر یك له وان دانا و اوانی
٤١ صاغ كردوه * و جنّانیش له زوران دهـاتنه دری دیان‌قیژاند و
دیان گت : اتو كوری خلّای . و كه هرشی د كرد نیدیشت كه اوان
قصان بكن چونكه دیان‌زانی كه او مسیحه *
٤٢ و كه روژ بو وه‌در كوت و چو جیبكی چول و خلكی حولیان بو وی
ددا و هاتن هتا كن اوی و اویان راد گرت كه له كن اوان نروا *

٤٣ بلا او به وانی گت : بو من لازمه که به شارانی دیکش پادشایتی
٤٤ خلای مزگینی بدم چونکه بو اوی ناردراوم * و ده کنشتانی جلیلیدا
وعظی دکرد *

## باب ٥

١ و بو که وختیکی خلکی له سر اوی خر بونوه که گوی له کلامی
٢ خلای بگرن و او لکن بحری جنیسارت راوستابو * دو گمیانی دی
لکن بحری راوستاو : بلا ماسیگران له وان وەدر کوتبون و تورانیان
٣ دشوشت * و ده یکیك لو گمیان که ای شمعونی بو وەژور کوت و له
وی طلب کرد که کمیك له وشکی دور بکیشی و رونیشت و له
٤ گمی جماعتانی تعلیم ددا * و که له قصه کردنی خلاص بو به شمعونی
٥ گت : لی خوری بو قولی و تورانی خوتان باویژن بو راوی * و شمعون
جوابی دا و کتی : ای اغا : ده همو شویدا زحمتمان کیشاوه و هیچمان
٦ نگرتوه : بلا به قصی تو توران داویژم * و که اویـــان کرد دوری
٧ جمعیکی زوری ماسیانیان گرت و تورانی وان ددران * و بو هاوالان
ده گمی دیکه دا اشارتیان کرد که بین و د گل اوان بکیشن . و هاتن
٨ و هر دوك گمیانیان پر کرد وها که اوان قم دبون * و که شمعون
پطروس دیتی کوته بر چوکانی یسوع دیگت : یا رب له کن امن
٩ وەدر بکوه چونکه پیاویکی گناحکارم * چونکه شیواوی اوی گرتبو
و همو اوانی که د گل اوی بون: له سر او راوی ماسیان که گرتبویان*
١٠ و هر واش یعقوب و یوحنّا : کورانی زبدی که شریکی شمعونی

بون . و يسوع به شمعونى گت : مترسه : له وى پاش انسانان د گرى *
١١ و كه گميانيان لسر وشكى هينابو همو چتيان بجى هيشت و وەدواى
وى كوتن *
١٢ و بو كه وختيكى او ده يكيك له شاراندا بو : اوتا پياويك پر له
گوليتى بو : و كه يسوعى دى به سر رو دا كوت و لى پاراوه ديگت :
١٣ يا رب اگر بتوى دتوانى امن پاك بكيوه * و دستى دريژ كرد و دستى
لى دا ديگت : دموى : پاك بـَوه . و جى بجى گوليتى له سر اوى
١٤ لا چو * و او حكمى لى كرد كه به هيچكس نلّى بلّا برو خوت به
كاهن نيشان بده و او قربانى بره بو پاك بونوى خوت چلونيكى موسى
١٥ امرى كردوه بو شايدى له سر اوان * بلّا خبرى بحثى وى هر پتر بلاو
بوه و جماعتانى زور خر بونوه كه گوى لى بگرن و كه له نخوشيانى
١٦ خويان صاغ ببنوه * بلّا او خوى وەلاى دكيشا ده چولاندا و دعاى
دكرد *
١٧ و بو ده يكيك لو روژاندا كه او تعليمى ددا و فريسيان و مُعلمانى
شريعت كه له هر دييكى جليلى و يهوديه و اورشليمى هاتبون رونيشتبون
١٨ و قوتى رب ده ويدا بو بو صاغ كردنوى * و اوتا چند كس پياويكى
كه افليج بو لسر دوشگيكيان دهينا و ديانويست كه اوى وەژور
١٩ بينن و ده پيش اوى داىبنين * و كه لبر خلكى ريان پيدا نكرد
كه اوى وەژور بينن : وەسر بانى كوتن و به نيو خشتاندا اويان دگل
٢٠ دوشگى بو نيوى لپيش يسوع دايشته خوارى * و كه باورى وانى دى

۲۱ کتی : ای پیاو : گناحانی تو به تو بخشراون* و خویندواران و فریسیان
دستیان پی کرد که فکر بکن دیان گت : اوه کییه که کفر دلّی ?
۲۲ کی دتوانی گناحان ببخشی بجگه له خلّای تنیا ? * بلّا که یسوع
۲۳ خیالانی وانی زانی جوابی دا و به وانی گت : ده دلّی خوتاندا چی
۲۳ فکر دکن ? * کیهه هاسانتره که بلّی : گناحانی تو به بخشراون یان
۲٤ که بلّی : هلَسته و بگَـری ? * بلّا هتا کو انگو بزانن که کوری انسانی
حکماتی هیه لسر ارضی که گناحان ببخشی : باو افلیجی گت : به
۲۵ تو دلّیم : هلسته و دوشگی خوت هلگره و برو مالی خوت * و جی
بجی هلستا لپیش اوان و او چتی که لسری کوتبو هلگرت و چو
۲٦ مالی خوی و شکری خلّای دکرد * و تعجوبی هموانی داگرت و
شکری خلّایان کرد و له ترس پر بون دیان گت : اورو چتـــانی
عجایبمان دیوه *

۲۷ و له پاش او چتانه وەدر کوت و رادارپکی دی که نیوی لیوی
۲۸ بو لکن گمر گی رونیشتبو و به وی گت : وەدوای من بکوه * و همو
۲۹ چتی بجی هیشت: هلستا و وەدوای وی کوت * و لیوی میمانییکی
گوری ده مالی خویدا بو وی کرد و جمعیـــکی زوری راداران و
۳۰ ایدیکان د گل اوان لسر سفری رونیشتبون * و فریسیان و خویندوارانی
وان لسر شاگردانی وی بولابولیان دکرد دیان گت : لبر چی د گل
۳۱ راداران و گناحکاران دخون و دخونوه ? * یسوع جوابی دا و به وانی

٣٢ گت : صاغان احتیاجی حکیمیان نیه بلّا نخوشان * نهاتوم که صادقان
بو توبی بانگ بکم بلّا گناحکاران *
٣٣ و اوان به ویبان گت : شاگردانی یوحنّا زور جاران روژو دگرن
٣٤ و دعا دکن : هر واش ای فریسیان : بلّا ایتو دخون و دخونوه * و
یسوع به وانی گت : اری انگو دتوانن بکن که خلکی داوتی روژو
٣٥ بگرن وختیکی زاوا دگل اوانه ؟ * بلّا روژان دین که زاوا له وان
٣٦ دستیندری و او وختی داو روژاندا به روژو دبن * و مثلیکیشی به وان
گت که هیچکس پَرویکی له جلّی تازه نادری و له جلّیکی کونی
بدا: اگر نه: او تازش ددری و پینی لو تازی ده کونَیدا جی ناگری*
٣٧ و هیچکس شرابی تازه ده مَشکانی کون تی ناکا : اگر نه : شرابی
تازه مَشکان دقلشینی و بو خوی درژی و مَشکان ضایه دبن *
٣٨ بلّا شرابی تازه ده مَشکانی تازه تی دکری:و هر دوکیان راد گیرین*
٣٩ و هیچکس که شرابی کونی خواردبیتوه ای تازي ناوی : چونکه
دلّی : او کونه چاتره *

## باب ٦

١ و بو که ده شمویدا به نیو زویان دا رادبرد و شاگردانی وی گلّیان
٢ دچنی و به دستان دیان‌پرواند و یان‌خوارد * بلّا هیندیك له فریسیان
٣ کتیان : بو چی دکن اوی که ده شمویدا درست نیه ؟ * و یسوع
جوابی دا و به وانی گت : اری اوشو نخویندوه که داود چی کرد

٤ وختیکی برسی بو او و اوانی که د گل اوی بون * چلون وەژور مالی
خلاّی کوت و نانی رابواردني هلگرت و خواردی و داشی به اوانی
که د گل اوی بون: اوی که حلال نیه که بیخوا مگر تنیا بو کاهنان؟*
٥ و به وانی گت : کوری انسانی ربّی شموییه *
٦ و بو ده شمویکی دیکه دا که او وەژور کنشتی کوت و تعلیمی
٧ ددا و پیاویك لوی هبو که دستی راستی وی وشك بو * و خویندواران
و فریسیان له وی سیاد بون که اگر ده شمویدا صاغی بکاتوه هتا کو
٨ گلییکی لی پیدا بکن * بلاّ او خیالانی وانی زانی و باو پیاوی که
دسته وشککی بو کتی : هلسته و راوسته نیوی ! و هلستا و راوستا *
٩ و یسوع به وانی گت : له انگو دپرسم اگر درسته ده شمویدا چا که
کردن یان خراپه کردن : خلاص کردنی گیانیکی یان هلاك
١٠ کردنی ؟ * و که تماشای دورندور لسر هموانی کرد به وی گت :
١١ دستی خوت دریژ بکه ! و کردی و دستی وی صاغ بووه * بلاّ اوان
پر له هاری بون و به یکتری قصەیان د کرد که د گل یسوع چی
بکن *
١٢ و بو که داو روژاندا بو کیوی وەدر کوت که نویژ بکا و شوی
١٣ به دعا کردنی خلاّی رابوارد * و که روژ بووه : شاگردانی خوی
بانگ کرد و دوازدی له وان هلبژارد که اوانیشی رسولان نیو نا *
١٤ شمعونی که پطروسیش نیو نا و اندریّاس برای وی یعقوب و یوحنّا
١٥ و فیلپوس و برتولمای* و متّی و توما و یعقوب کوری حلفی و شمعون

۱٦ که غیرتدار بانگ دکری * و یهودای یعقوبی و یهودای اسخریوطی
که تسلیمکر بو *
۱۷ و که دگل اوانی هاتبوه خواری : لسر جییکی دشت راوستا و
دگلی جماعتیکی زور له شاگردانی وی و جمعیکی زور له قومی له
۱۸ همو یهودیه و اورشلیمی و قراغی بحری صور و صیدون * که هاتبون
هتاکو گوی لی بگرن و که له نخوشیانی خویان صاغ ببنوه . و اوانی
۱۹ که له روحانی پیس اذیتیان دکیشا صاغ بونوه * و همو خلکی
دیان‌ویست که دستی لی بدن چونکه قوتیك له وی وه‌در دکوت و
۲۰ هموانی صاغ دکردوه * و او چاوانی خوی لسر شاگردانی هلینا و
کتی : خوزگه به انگو ای فقیران : چونکه پادشایتی خلای ای انگو
۲۱ یه * خوزگه به انگو که اویستا برسین : چونکه تیر دبن . خوزگه
۲۲ به انگو که اویستا دگرین : چونکه پیدکنن * خوزگه به انگو وختیکی
خلکی انگو دبغضینن و وختیکی انگو له خویان جوی دکنوه و جنیوو
پی ددن و نیوی انگو وکو چتیکی خراپ وه‌در دخن بو خاطری کوری
۲۳ انسانی*داو روژاندا شاد بن و کیفخوشی بکن:چونکه اوتا حقی انگو
ده آسماندا زوره . چونکه هر باو طرزه باپیرانی وان به پیغمبرانیان
۲٤ دکرد * بلا وای بو انگو ای دولامندان : چونکه دلخوشی خوتانو
۲۵ ورگرتوه * وای بو انگو که اویستا تیرن : چونکه برسی دبن . وای
۲٦ بو انگو که اویستا پیدکنن : چونکه شینی دکن و دگرین * وای بو
انگو وختیکی همو کس به چاکی بحثی انگو دکن : چونکه باپیرانی

وان هر باو طرزه دگل پیغمبرانی دروزنیان دکرد *
٢٧ بلّا به انگو که گوی دگرن دلّیم : دژمنانی خوتان بحبینن : بو
٢٨ اوانی که انگو دبغضینن چاکی بکن * بو اوانی که له انگو لعنت
دکن برکت طلب بکن و بو اوانی که خراپ بحثی انگو دکن دعای
٢٩ خیر بکن * اوی که له رومتیکی تو ددا : اوی دیکشی بو ورگیره .
٣٠ و اوی که عبّات دستینی : کراسکش لی منع مکه * هر کس که
له تو طلب دکا بده : و اوی که مالی تو دستینی لی طلب مکەوه *
٣١ و چلونیکی که دتانوی که خلکی دگل انگو بکن : هر واش دگل
٣٢ اوان بکن * و اگر انگو اوان بحبینن که انگو دحبینن منّتو چیه ؟
٣٣ چونگه گناحکارانیش دحبینن اوانی که اوان دحبینن * چونکه اگر
چاکش بکن بو اوانی که بو انگو چاکَی دکن منّتو چیه ؟
٣٤ گناحکارانیش هر وا دکن دکن*و اگر قرض بدن به اوانی که هومیدو
هبی له وان بستیننوه منّتو چیه ؟ گناحکارانیش به گناحکاران قرض
٣٥ ددن هتاکو اوندی بستیننوه * بلّا دژمنانی خوتان بحبینن و چاکی
بکن و قرض بدن بی هومیدی استاندنوی : و حقی انگو زور دبی
٣٦ و کورانی تعالی دبن چونکه او لسر بی منّتان و خراپان چاکه * به
٣٧ رحم بن چلونیکی بابی انگو به رحمه * و حکمی مکن و قط لسر
انگو حکم ناکری : و خطادار مکن و قط خطادار ناکرین . ببخشن
٣٨ و دبخشرین * بدن و به انگو ددریتوه . پیوانیکی چاك : شیلدراو :

راوشاندراو و ريژاريژ ده كوشى انگو دا دكن: چونكه به هر پيوانيكى
كه ديپون بو انگو ديپوريتوه *
٣٩ و مثليكيشى به وان گت : مگر كويريك كويريك دتوانى كويريكى بلدى
٤٠ بكا ? ارى هر دوك ده چاليدا ناكون ? * شاگرد له ماموستا زياتر نيه :
بلّا هر كس كه كامله وكو ماموستاى خوى دبى *
٤١ و بو چى پوشكى ده چاوى برات دا دبينى : بلّا له كاريتى ده چاوى
٤٢ خوتدا اگات لى نيه ? * چلون دتوانى به برات بلّي : اى برا ليم
گرى كه پوشكى كه ده چاوى تو دايه درى ينم : كه بو خوت كاريتى
ده چاوى خوتدا نابينى ? اى رياكار : هولى او كاريتى له چاوى خوت
درينه و او وختى چاك دبيني كه پوشكى كه ده چاوى برات دايه
درى يني *
٤٣ چونكه داريكى چاك نيه كه ميوى خراپ بينى : و ايدى نهش
٤٤ داريكى خراپ كه ميوى چاك بينى * چونكه هر داريك له ميوى
خوى دناسرى : چونكه له دروان هنجيران خر ناكنوه و له گوينى
٤٥ ترى له ناكنوه * انسانى چاك له خزينى چاكى دلى خوى چتى چاك
در دينى و اى خراپ له خزينى خراپى چتى خراپ در دينى : چونكه
٤٦ له زيدى دلّ زارى وى قصان دكا * بلّا بو چى انگو امن رب بانگ
دكن و او چتى كه دلّيم نايكن ? *
٤٧ هر كس كه بيته كن امن و له قصانى من گوى بگرى و اوانى
٤٨ بجى بينى : به انگوى نيشان ددم كه به كى دشبهى * دشبهى به پياويكى

که خانویکی درست د کا : که هلی د کند و قولی کرد و بناغی لسر
شاخی دانا . و که سیلاو هات چومی لو خانوی خست و نیتوانی اوی
٤٩ بزوینی لبر اوی که او چاكِ درست کرا بو * بلّا اوی که دبیی و نایکا
دشبهی به پیاویکی که خانویکی لسر ارضی بی بناغه درست کرد و
چومی لی خست و جی بجی کوت و روخاندنی او خانوی گوره بو *

## باب ۷

١ وختیکی همو قصکانی خوی ده گوی قومیدا خــلاص کردبو
٢ وەژور کفرناحومی کوت * و عبدیکی یوزباشی که لکن اوی خوشوست
٣ بو نخوش و نیزیکی مردنی بو * و که بحثی یسوعی بیست چند پیرانی
٤ یهودیانی نارده کن اوی و تکای لی د کرد که بی و عبدی وی خلاص
٤ بکا * و که اوان هاتنه کن یسوع : زور پارانوه دیان گت : لایقه که
٥ او چتی بو وی بکی * چونکه ملّتی مـَی خوش دوی و او بو مه کنشتی
٦ درست کردوه * و یسوع د گل اوانی چو . بلّا وختیکی او ایدی دور
له مالی نبو : یوزباشی چند دوستانی نارد : به وی دیگت : یا رب
زحمت مکیشه چونکه امن لایق نیم که لبن میچی من وەژور بکوی*
لبر اوش خومم لایق حساب نکرد که بیمه کن اتو : بلّا قصیکی بلّی
٨ و خذمتکاری من صاغ دیتوه * چونکه امنیش پیاویکم لبن حکمات
داندراو و عسکران به دستی خومم هیه و به یکیك دلّیم : برو و درواٰ:
٩ و به یکی دیکه : وره و دی : و به عبدی خوم اوی بکه و دیکا * بلّا

وختیکی یسوع اوی بیست له وی عجایب ما و ورگَرا بو خلکی که
وەدوای وی دکوتن و کتی : به انگو دڵیم : ده اسرائیلیشدا وها
١٠ باوریکی گورم پیدا نکردوه * و که ناردراوان بو مالی گَرانوه :
او عبدەیان صاغ پیدا کرد *
١١ و بو که ده روژی دیدا : بو شاریکی که نائین بانگ دکرا دچو
١٢ و شاگردانی وی و خلکیکی زور دگل اوی دچون * و که نیزیکی
دروازی شاری بو : اوتا مردویك دبردرا بو دری : کوری تاقانی
دایکی خوی : و او بیوەژن بو . و زور خلکی شاری دگل اوی بون *
١٣ و که رب اوی دی دڵی بو وی سوتا و به وی گت : مگریی *
١٤ و هاته پیشی : دستی له تابوتی دا و هلگران راوستان : و کتی : ای
١٥ جوان به تو دڵیم : هلسته ! * و مردو که راست رونیشت و دستی پی
١٦ کرد که قصان بکا : و اوی به دایکی خوی دا * و ترس هموانی
داگرت و شکری خڵایان دکرد دیان گت : پیغمبریکی گوره لنیو مه
١٧ هلستاوه و خڵا تماشای قومی خوی کردوه * و او خبری بحثی وی ده
همو یهودیه و ده همو ولاتی دورندور دا وەدر کوت *
١٨ : ١٩ و شاگردانی یوحنّا له همو او چتانی به وی خبریان دا * و یوحنّا
دو کس له شاگردانی خوی بانگ کرد و ناردیه کن رب دیگت :
٢٠ اری اتوی اوی که دی یان چاوەنوری یکی دیکه ببین ؟ * و که
او پیاوانه هاتنه کن اوی کتیان : یوحنّا تعمیددر امَی ناردوه کن
اتو دڵی : اری اتوی اوی که دی یان چاوەنوری یکی دیکه ببین ؟ *

٢١ داو سعاتیدا زورانی له نخوشیان و دردان و روحـانی پیس صـاغ
٢٢ د کردوه و به زور کویران دیتنی دبخشی * و جوابی دا و به وانی
گت : برون و به یوحنّا خبر بدن له او چتانی که دیوتانه و بیستوتانه :
کویران دیینن : شلان د گـَرین : گولان پاكـ د کرینوه : کران دیین :
٢٣ مردوان هلدستیندرینوه و به فقیران مزگینی ددری * و خوزگه به هر
کسیکی که له من هلنانگوتری *
٢٤ و که ناردراوانی یوحنّا روین : دستی پی کرد که بحثی یوحنّا
بو خلکی بلّی : بو تماشا کردنی چی بو نیو چولی وه‌در کوتن ؟ اری
٢٥ قامیشیکی که به بای دبزوی ؟ * بلّا بو دیتنی چی وه‌در کوتن ؟
اری پیاویکی به جلّی ناسك ده‌بر کراو ؟ اوتا : اوانی که به جلّی به
٢٦ شوقت و ده عیشدا دژین : ده عمارتانی پادشایان دان * بلّا بو دیتنی
چی وه‌در کوتن : اری پیغمبریکی ؟ بلی : به انگو دلّیم : پتریش
٢٧ له پیغمبریکی * اویه که بحثی وی نوسراوه : اوتا دنیرمه پیش روی
٢٨ تو ملایکتی خوم : اوی که ریك دخا ریی تو پیشی تو * به انگو دلّیم :
لنیو اولادانی ژنان کس له یوحنّا گوره‌تر نیه : بلّا اوی که پچوکتره
٢٩ ده پادشایتی خلّایدا له اوی گوره‌تره * و همو قومی که بیستیان و
راداران : تصدیقی خلّایان کرد به وی که به تعمیدی یوحنّا تعمید
٣٠ کران * بلّا فریسیان و شرعزانان تگبیری خلّای درحقی خویان
٣١ بطالیان کرد به وی که له وی تعمید نکران * دنا خلکی او سلسلی
٣٢ به چی بشبهینم و به چی دشبهین ؟ * دشبهین به مندالان که ده میدانا ندا

رودنیشن و بو یکتری بانگ دکن و دلّین : بو انگو زورنامان لیدا
٣٣ و هلنپرین . شینـیمان کرد و نگریان * چونکه یوحنّا تعمیددر هاتوه .
نه نانی د‌نوا و نه شراپ دخواتوه : و انگو دلّین : جنّی هیه *
٣٤ کوری انسانی هاتوه . دخوا و دخواتوه : و انگو دلّین : اوتا پیاویکی
٣٥ زورخور و شراپ‌خور: دوستی راداران و گناحکاران ! * و عقلداری
له همو مندالانی خوی تصدیق بوه *
٣٦ و یکیك له فریسیان لی طلب کرد که دگل اوی نان بخوا . و
٣٧ وه‌ژور مالی فریسیی کوت و لسر سفری رونیشت * و اوتا ژنیکی
گناحکار داو شاریدا هبو : و وختیکی زانی که ده مالی فریسیی لسر
٣٨ سفری رونیشت : شوشیکی رونی بونخوشی هینا * و له پشتوه لکن
پیانی وی راوستا و دگریا و دستی پی کرد که پیانی وی به فرمیسکان
تر بکا : و به موی سری خوی وشکی دکردوه و پیانی وی ماچ
٣٩ دکرد و به رونی بونخوش چوری دکرد * بلّا وختیکی او فریسیی
که اوی بانگ ایشتبو دیتی : ده خویدا قصی دکرد و دیگت : اوه
اگر پیغمبر بایه دیزانی او ژنی که دست لی ددا کییه و چلونه :
٤٠ چونکه گناحکاره * و یسوع جوابی دا و به وی گت : ای شمعون :
٤١ چتیکم هیه که به تو بلّیم . و او کتی : ای ماموستا بلّی ! * طلبکاریك
دو قرضدارانی هبو . یکیك پینج صد دینار قرضدار بو و اوی دیکه
٤٢ پینجا * که هیچیان نبو که ادای بکن هر دوکی بخشی . دبا کیهه
٤٣ له وان اوی پتر خوش دوی ؟ * شمعون جوابی دا و کتی : فکر دکم

اوی که پتری پی بخشی . و او به وی گت : راستت حکم کرد *
٤٤ و که بو ژنکی ورگـَرا : به شمعونی گت : اری او ژنی دييني ؟
وەژور مالی تو کوتم . آوت بو پيانی من ندا . بڵا اوه پيانی من به
٤٥ فرميسکانی تر کردوه و به موی خوی وشکی کردوه * ماچيکت به
من ندا بڵا اوه لو وختی که وەژور کوتم له ماچ کردنی پيانی من
٤٦ رانوستاوه * سری من به رون چورت نکرد بڵا اوه پيانی منی به
٤٧ رونی بونخوش چور کردوه * لبر اوی به تو دڵيم : گناحانی زوری
وی بخشراون چونکه زوری خوش ويست. بڵا اوی که کم دبخشری
٤٨ کم خوش دوی * و بـه وی گت : گناحـانی تـو بخشراون *
٤٩ و اوانی که دگلی لسر سفری رونيشتبون دستيان پی کرد که ده
٥٠ خويا ندا بڵين : اوه کييه که گناحانيش دبخشی ؟ * و به ژنکی گت:
ايمانی تو اتوی خلاص کردوه : به سلامتی برو ! *

## باب ٨

١ و بو له پاش اوی : که او شار به شار و ديی به دين دگـَرا : وعظی
دکرد و مزگيني پادشايتی خڵای ددا : و او دوازدانه دگل اوی بون *
٢ و چند ژنان که له روحانی پيس و نخوشيان صاغ ببونوه يعنی مريم
٣ که مجدلی بانگ دکرا که له اوی حوت جنّان وەدر کوتبون * و
يونّا ژنی خوزا ناظری هيروديس : و سوسنّه و زورانی ديکه که به
مالی خويان خذمتيان به وان دکرد *

٤ و كه خلكيكى زور خر بونوه و له هر شاريكى دهاتنه كن اوى :
٥ به مثليكى گت * توچين وەدر كوت كه توى خوى بچينى : و كه او
توى دچاند هينديك كوته سر ريى و پامال بو و طيرانى آسمان اويان
٦ خوارد * و هينديك كوته سر جييكى برداوى و كه روا وشك بو
٧ چونكه تراى نبو * و هينديك كوته نيو دروان و كه دروان دگلى
٨ هلچون اويان خنكاند * و هينديك كوته سر ارضى چاك و كه گوره
بو يك و صد برى هينا . كه او چتانى دگت قيژاندى : اوى كه
گوى بيستنى هيه با بيبى ! *
٩:١٠ بلّا شاگردانى وى پرسياريان لي كرد كه او مثلى چى بى * و او
كتى : به انگو دراوه كه سرانى پادشايتى خلّاى بزانن : بلّا به ايديكان
١١ به مثلان : هتا كو دبينن و نابينن و دبين و نافامن * بلّا او مثله اويه :
١٢ تو كه كلامى خلّا يه * و اوان لسر ريى اوانن كه دبين . له پاشان
شيطان دى و كلامى له دلّى وان لا دبا: نبا ايمان بينن و خلاص ببن*
١٣ و اوان لسر جيبى برداوى اوانن كه وختيكى دبين : به خوشحالى
كلامى قبول دكن و اوانه رگيان نيه : هتا دميكى ايمان دينن و ده
١٤ وختى تجربيدا دكون * و اوى كه كوته نيو دروان اوانن كه بيستويانه
و كه لبن خمان و دولت و لذتانى ژيانى دگرين دخنكيندرين و برى
١٥ گيشتو نانين * بلّا اوى لسر ارضى چاك اوانن كه وختيكى به دلّيكى
چاك و زريف كلاميان بيستوه : رايد گرن و به صبر بر دينن *
١٦ امّا هيچكس وختيكي چرايكى هلكردوه اوى لبن قاپيكى

ناشیریتوه یان لبن تختیکی دانانی : بلّا لسر پیچرا دادنی هتا کو اوانی
١٧ که دینه ژوری رونا کای ببینن * چونکه هیچ چتیك شاردراو : نیه
١٨ که اشکرا نبی و نه چتیك به دزی که نناسری و نیته دری * دنا تماشا
بکن چلون دبین : چونکه هر کس که هیَتی به وی ددری و هر
کس که نیَتی اوی که فکر دکا که هشیَتی لي دستیندری *
١٩ بلّا دایك و برایانی وی هاتنه کن اوی و نیان‌توانی بگنه کنی
٢٠ لبر خلکی * و خبر به وی درا : دایك و برایانت له دری راوستاون
٢١ و دیانوی که اتو ببینن * بلّا او جوابی دا و به وانی گت : دایك و
بِاریانی من اوانن که کلامی خلّای دبین و بجی دینن *
٢٢ و بو ده یکیك لو روژاندا که او وەسر گمییکی کوت و شاگردانی
٢٣ ویش : و به وانی گت : با پیرینوه او بری بحری ! و چون * بلّا
وختیکی اوان دچون او نوست . و گیژیکی بای هاتە خواری لسر
٢٤ بحری و پر دبونوه و ده ترسدا بون * و هاتنه کنی و اویان وەخبر هینا
دیان گت : ای ماموستا ماموستا : هلاك دبین ! بلّا او هلستا و هرشی
٢٥ له با و شپولانی کرد و رحت بون و آرام بو * و به وانی گت :
ایمانو لکوی یه ؟ بلّا ترسان و عجایب مان و به یکتریان دگت :
دنا اوه کییه که لسر بایان و آویش امر دکا و اطاعتی وی دکن ؟ *
٢٦ و سواری گمی بون بو ولاتی جرەسنیان که برامبری جلیلی یه *
٢٧ و که لسر ارضی وەدر کوت پیاویك له شاری توشی وی بو که جنّانی
هبو و دمیکی زور هیچ جلّی دەبر نکردبو و ده مالیدا ندما بلّا لنیو

٢٨ قبران * و كه يسوعى دى قيژاندى : لپيش اوى كوت و به دنگيكى
بلند كتى : چم د گل تو هيه : اى يسوع كورى خلّاى تعالى : تكات
٢٩ لى دكم عاذابم مده ! * چونكه له روحى پيسى امر كرد كه له او
انسانى وەدر بكوى . چونكه گليك جاران اوى گرتبو : و به زنجيران
و كوتان بسترا بووه و رايگيرا بو و بندانى پساند و له جنّى بو نيو
٣٠ چولى خسترا بو * بلّا يسوع لي پرسى : نيوت چيه ؟ و او كتى :
٣١ لجيون : چونكه زور جنّان وەژور اوى كوتبون * و لى پارانوه كه له
وان امر نكا كه بچنه بن ارضى * بلّا لوى لسر كيوى گارانيكى زورى
برازان له لورى بو و لى پارانوه كه به وان اذن بدا كه وەژور اوانى
٣٣ بكون . و اوانى اذن دا * و جنّان له او پياوى وەدر كوتن و چونه نيو
برازان و گارانكه خويان له سربرەژورى هلداشته خوارى ده بحريدا
٣٤ و خنكان * بلّا وختيكى برازوانان ديتيان او چتى كه ببو هلاتن و ده
٣٥ شارى و دييانداخبريان دا * و وەدر كوتن كه ببينن او چتى كه ببو و
هاتنه كن يسوع : و او پياوى كه جنّان له وى وەدر كوتبون پيدايان
٣٦ كرد رونيشتو و دەبر كراو و عاقل له بر پيانى يسوع : و ترسان * بلّا
اوانى كه ديبويان خبريان به وان دا چلون او جنّداره خلاص ببو *
٣٧ و همو خلكى ولاتى دورندورى جرەسنيان لييان طلب كرد كه له
كن اوان بروا چونكه به ترسيكى گوره گيرا بون . و او وەژور گمى
٣٨ كوت و گَراوه * امّا او پياوى كه جنّان له وى وەدر كوتبون تكاى
٣٩ لى كرد كه دگل اوى ببى . بلّا اوى مرخص كرد ديگت * بگَريوه

بو مالی خوت و خبر بده چی چتیکی گوره خلّا د گل اتوی کردوه .
و چو و ده همو شاریدا وعظی د کرد چی چتیکی گوره یسوع د گل
اوی کردبو *
٤٠ بلّا وختیکی یسوع گـَراوه خلکی اویان قبول کرد چونکه همویان
٤١ چاوه‌نوری وی بون * و اوتا پیاویك نیوی یایروس هات و او مزنی
کنشتی بو و له بر پیانی یسوعی کوت و لی پاراوه که بیته ژور مالی
٤٢ وی * چونکه کچیکی تاقانی هبو به قد داوزده سالانه و نیزیکی
مردنی بو . و که او دچو خلکی اویان ریك د کـُشی *
٤٣ و ژنیکی که مدی دوازده سالان خوین له بر چونی هبو و که
نیتوانی به هیچکس صاغ بکریتوه : له پشتوه هات و دستی له داوینی
٤٤:٤٥ جلّی وی دا * و جی بجی خوین له بر چونی وی برا * و یسوع
کتی : کی دستی له من دا ؟ بلّا که هموان حاشایان د کرد پطروس
٤٦ کتی : ای ماموستا : خلکی زحمت به تو ددن و اتو ریك د کـُشن * بلّا
یسوع کتی : کسیك دستی له من دا چونکه امن زانیم که قوتیك
٤٧ له من وه‌در کوت * و که ژنکه دیتی که نشاردرا بووه : به لرزین
هات و کوته پیشی و لپیش همو قومی خبری دا که له چی سبب دستی
٤٨ له وی دا : و چلون جی بجی صاغ بووه * و او به وی گت : ای کچ :
ایمانی تو اتوی خلاص کردوه : به سلامتی برو *
٤٩ هیشتا او قصی د کرد یکیك له مالی مزنی کنشتی هات دیگت :
٥٠ کچکت مردوه : ایدی ماموستای زحمت مده ! * بلّا وختیکی یسوع

یستی به وی جوابی دا : مترسه : فقط ایمان بینه و خلاص دیتوه *
٥١ و که چو ژور مالی نیٖیشت کس د گل اوی وهژور بکوی بجگه له
٥٢ پطروس و یوحنّا و یعقوب و باب و دایکی کچکی * و همویان
دگریان و شینییان بو وی دکرد : امّا او کتی : مگرین : نمردوه
٥٣: ٥٤ بلّا نوستوه * و پی پیکنین چونکه دیان‌زانی که مردبو * بلّا او دستی
٥٥ وی گرت :دنگی دا دیگت : ای کچ : هلسٹه ! * و روحی وی
گراوه و جی بجی هلستا : و امری کرد که چتیکی خواردنی به وی
٥٦ بدری * و والدینی وی مات بون : و حکمی له وان کرد که له او
چتی که بیو به هیچکس نلّین *

## باب ٩

١ و او دوازدانی بانگ کرد و قوت و حکماتی لسر همو روحانی
٢ پیس به وان دا : و که نخوشیان صاغ بکنوه * و اوانی نارد که
٣ پادشایتی خلّای وعظ بکن و که نخوشان صاغ بکنوه * و به وانی
گت : چتیك بو ریی هلمگرن : نه عصا نه توربین نه نان نه دراو و
٤ نهشی هر کسیك دو کراسی هبی * و ده هر مالیکیدا که وهژور
٥ دکون : لوی بمینن و له اوی برون * و هر کامیکی که انگو قبول
نکن : وختیکی لو شاری دینه دری : توزی له پیانی خوتان بتکینن
٦ بو شایدی لسر اوان * و وهدر کوتن و ده دییان دگران و انجیلیان
وعظ دکرد و ده همو جییکیدا صاغیان دکردوه *

۷ بلّا هیرودیس تیترارك بیستی او همو چتانی که دبون و تواو به
شك بو : چونکه له هیندیکی کترا که یوحنّا له نیو مردوان هلستاوتوه*
۸ و له هیندیکی که الیاس بیندراوه : بلّا له ایدیکان که پیغمبریك :
۹ یکیك له قدیمیان هلستاوتوه * امّا هیرودیس کتی : یوحنّا امن بی
سرم کردوه : بلّا اوه کییه که بحثی وی او جور چتانی دبیم ؟
و دیویست که ببینی *
۱۰ و که رسولان گَرانوه له هر چی که کردبویان خبریان به وی دا.
و اوانی هلگرت و خوی وەلا کیشا بتنی بو شاریکی که بیت‌صیدا
۱۱ بانگ د کرا * بلّا وختیکی خلکی اویان زانی : وەدوای وی کوتن .
و اوانی قبول کرد و بحثی پادشایتی خلّای بو وان قصی د کرد : و
۱۲ اوانی که محتاجی صاغ بونوی بون صاغی د کردنوه * بلّا وختیکی
روژ آوا بونی دست پی د کرد : او دوازدانه هاتنه پیش و به ویان
گت : خلکی مرخص بکه هتاکو بو دییان و مزرایانی دور ندور
بچن و منزل بگرن و خوراك پیدا بکن چونکه لیره ده جییکی چولدا
۱۳ هَین * بلّا او به وانی گت : انگو به وان بدن که بخون . بلّا اوان
کتیان : امه پتر له پینج نان و دو ماسیمان نیه . مگر امه بچین و بو
۱٤ همو او خلکی خوراك بکرین * چونکه به قد پینج هزار پیاو بون .
و به شاگردانی خوی گت : اوانه رونیشینن به دسته دسته : هر یکی
۱۵ : ۱٦ به قد پینجا کس * و وهایان کرد و همویان رونیشاندن * و که او
پینج نانان و دو ماسیانی هلگرت : روی ده آسمانی کرد : اوانی

ممبارك کرد و لتی کرد و دای به شاگردان که لپیش خلکی دابنین *
١٧ و خواردیان و همویان تیر بون : و له لتکان که له وان مابونوه دوازده
قرتاله پر هلگیرانوه *
١٨ و بو که وختیکی او دعای دکرد شاگردان بتنی دگل اوی بون
١٩ و له وانی پرسی دیگت : خلکی کی دلین که امن بم ؟ * و اوان
جوابیان دا و کتیان : یوحنّا تعمیددر وهیندیك الیاس : بلا ایدیکان
٢٠ که پیغمبریك : یکیك له قدیمیان هلستاوتوه * و او به وانی گت : بلا
انگو کی دلین که امن بم ؟ و پطروس جوابی دا و کتی : مسیح ای
٢١ خلای * و قدغی له وان کرد و اسپاردی که او چتی به هیچکس
٢٢ نلین * دیگت : لازمه بو کوری انسانی که اذیتی زور بکیشی و رد
بکری له پیران و کاهنانی گوره و خویندواران : و بکوژری و ده
روژی سیمدا هلبستیندریتوه *
٢٣ و به هموانی گت : اگر کسیك بیوی له دوای من بنی : با له خوی
ببوری و هر روژ سیداری خوی هلگری و وهدوای من بکوی *
٢٤ چونکه اوی که بیوی گیانی خوی خلاص بکا ونی دکا : بلا اوی
٢٥ که گیانی خوی بو خاطری من ون بکا او خلاصی دکا * چونکه بو
انسان چی فایدی یه اگر همو دنیایی قازانج بکا بلا خوی ون یان خسار
٢٦ بکا ؟ * چونکه هر کس که له من و له کلامی من شرمی بکا :
کوری انسانیش له اوی شرمی دکا وختیکی دی ده جلالی خوی
٢٧ و ای باب و ای ملایکتانی مقدس دا * بلا راستی به انگو دلیم : له

راوستاوان لیره هیندیك هن کن مردنی قط ناچیژن هتا پادشایتی خلای
نبینن *
۲۸ و بو به فد هشت روژان له پاش او قصانه که پطروس و یوحنّـــا
۲۹ و یعقوبی هلگرت و وەسر کیوی کوت که دعا بکا * و که او دعای
۳۰ دکرد : شکلی روی وی گورا و جلی وی سپی و ترشکدار بون * و
اوتا : دو کس دگل اوی قصەیان دکرد : که موسی و الیاس بون *
۱۳ که ده جلالدا بیندران و بحثی روینی وی که ده اورشلیمیدا دبا تواوی
۳۲ بکا : قصەیان دکرد * امّا پطروس و اوانی که دگل اوی بون له
خـوی گران بون : بلّا وختیکی چاك وەخبر هاتن : جلالی وی و او
۳۳ دو کسانەیان دی که دگل اوی راوستابون * و بو که وختیکی اوان
له اوی جوی بونوه : پطروس به یسوعی گت : ای ماموستا : چاکه
که امه لیره بین . و با سـی کپران درست بکین : یکیك بو تو و
۳٤ یکیك بو موسی و یکیك بو الیاس : نیدزانی چی دگت * بلّا وختیکی
اوانی دگت : هوریك هات و سیبری خسته سر اوان . و که اوان
۳٥ وەژور هوری دکوتن ترسان * و دنگیك له هوری بو دیگت : اویه
۳٦ کوری من : او هلبژیراو : گوی لی بگرن ! * و که او دنگی بو :
یسوع بتنی پیدا بو . و اوان بی دنگ بون و بو هیچکس داو روژاندا
خبریان ندا له او چتانی که دیبویان *
۳۷ و بو که ده روژی دیدا وختیکی اوان له کیوی هاتنه خواری :
۳۸ خلکیکی زور به پیروی وی هاتن * و اوتا : پیاویك له خلکی قیژاندی

دیگت : ای ماموستا : تکات لی دکم تماشا بکه له کوری من چونکه
٣٩ تاقانی منه * و اوتا روحیك اوی دگری و جی بجی دچریکینی و اوی
ددری وها که کف هلدخرینی و به زحمت له وی دروا و شلوکُتی
٤٠ دکا * و له شاگردانی تو تکام کرد که اوی در بکن و نیان‌توانی *
٤١ بلاّ یسوع جوابی دا و کتی : ای سلسلی بی ایمان و لا ری : هتــا
کنگی دگل انگو بم و له انگو صبری بکم ؟ کوری خوت بینه ایره!*
٤٢ و که هیشتا او دهاته پیش : جن اوی خسته خواری و دراندی . بلاّ
یسوع هرشی لو روحی پیسی کرد و کورکی صاغ کردوه و دای به
٤٣ بابی خوی * و هموان له گوری خلاّی شیوان . بلاّ وختیکی هموان
عجایب دمان له سر همو چتانی که دیکرد : به شاگردانی خــوی
٤٤ گت : انگو او قصانه ده گویانی خوتاندا دابنین چونکه کوری انسانی
٤٥ تسلیم به دستانی انسانان دکری * بلاّ اوان او قصی تی نگیشتن و له
وان شاردراو بووه وها که اویان نفامی و دترسان که بحثی او قصه
له وی بپرسن *
٤٦:٤٧ و خیالیك لنیو وان پیدا بو که کیهه له وان گوره‌تر بی * و که
یسوع خیالی دلّی وانی زانی : مندالیکی گرت و اوی لکن خوی
٤٨ راگرت * و به وانی گت : هر کس که او مندالی به نیوی من قبول
بکا : امن قبول دکا : و هر کس که امن قبول بکا : اوی قبــول
دکا که امنی ناردوه . چونکه اوی که لنیو انگو چکوله‌تره : او
گوره یه *

٤٩ يوحنّا جوابي دا و كتى : اى ماموستا يكيكمان دى كه جنّانى
به نيوى تو در د كرد و منعمان لي كرد چونكه د گل امه نا كوى *
٥٠ و يسوع به وى گت : منعى مكنِ : چونكه اوى كه ضدى انگو نيه :
له لاى انگو يه
٥١ و بو كه وختيكى روژانى هلكيشرانى وى تواو دبون : و او روى
٥٢ خوى قايم دانا كه بو اورشليمى بروا * و قاصدانى ده پيش خويدا نارد
و چون و وەژور دييكى سماريان كوتن هتا كو بو وى حاضر بكن *
٥٣:٥٤ و اويان قبول نكرد چونكه روى وى بو اورشليمى دچو* بلّا وختيكى
شاگردان:يعقوب و يوحنّا ديتيان كتيان:اى رب:ارى دتوى كه بلّيين كه
٥٥ آور له آسمانى بيته خوارى و اوانى هلاك بكا ؟ * بلّا او ورگَرا
و اوانى زم كرد و كتى : انگو نازانن له كيهه روح هن . چونكه
كورى انسانى نهاتوه كه گيّانى بني آدمى هلاك بكا بلّا كه خلاص
٥٦ بكا * و بو دييكى ديكه چون *
٥٧ و كه اوان ده ريبدا دچون كسيك به وى گت : هر جييكى كه
٥٨ بچي وەدواى تو د كوم * و يسوع به وى گت : ريويان كُنانيان هيه
و طيرانى آسمان هيلانان بلّا كورى انسانى جي نيه كه سرى لى
٥٩ دابنى * امّا به ايديكى گت : وەدواى من بكود . بلّا او كتى : اذنم
٦٠ بده كه هولى بچم و بابى خوم بنيشم * امّا او به وى گت : له مردوان
گرى كه مردوانى خويان بنيشن : بلّا اتو بچو پادشايتى خلّاى وعظ
٦١ بكه * و يكي ديكش كتي : وەدواى تو د كوم : يا رب : بلّا

هولی اذنم بده که له اوانی که ده مالی خوم دان خلّاحافظی بکم *
٦٢ بلّا یسوع به وی گت : کسیك که دست لسر آموری دابنی و تماشای
پشتوه دکا : لایقی پادشایتی خلّای نیه *

## باب ۱۰

۱ له پاش او چتانه رب حفتای دیکی هلبژارد و اوانی نارد دو دو
لپیش روی خوی بو هر شار و جییکی که او بو خوی طمای بو که بی*
۲ و به وانی گت : به راستی درووینه زوره بلّا فعلان کمن . دنا له
۳ صاحبی درووینی طلب بکن که فعلان بو درووینی خوی در بکا * برون:
٤ اوتا انگو دنیرم وکو برخان لنیو گُرگان * نه کیسه نه توربین و نه
٥ کوشان هلگرن : و ده رییدا له کس سلاوی مـــکن * بلّا ده هر
٦ مالیکیدا که وەژور دکون : هولی بلّین : سلام بو او مالی بی ! * و
اگر کوریکی سلامی لوی بی : سلامی انگو لسر اوی رادوستی :
۷ بلّا اگر نه : لسر انگو دگَـَریتوه * بلّا داو مالیدا بمینن که بخون و
بخونوه له چتانی وان : چونکه فعله لایقی حقی خویتی . له مال بو مال
۸ مچن * و ده هر شاریکیدا که وەژور دکون و انگو قبول دکن :
۹ او چتانی که لپیش انگو دادندرین بیخون * و او نخوشان که ده وی
دان صاغ بکنوه و به وان بلّین : پادشایتی خلّای لسر انگو نیزیك
۱۰ بوه * بلّا ده هر شاریکیدا که وەژور دکون و انگو قبول نکن : وەدر
۱۱ بکون ده کوچانی ویدا و بلّین * او توزش که له شاری انگو به پیانی

مه نوساوه بو انگوی دتکینین : بلّا اوی بزانن که پادشایتی خلّای
١٢ نیزیك بوه * به انگو دلّیم : که داو روژیدا بو سدومی هاسانتر دبی
له بو او شاری *
١٣ وای بو تو ای خورزین : وای بو تو ای بیت‌صیدا : چونکه اگر
او قوتانه که ده انگو دا کراون ده صور و صیدوندا کرابان : له میژ
١٤ بو ده پلاس و خولمیش رونیشتو توبه‌یان دکرد * بلّا ده روژی دیواندا
١٥ بو صور و صیدون هاسانتر دبی له بو انگو * و اتو ای کفرناحوم :
١٦ مگر هتا آسمان بلند نبوی ؟ هتا جهنمی دخریه خواری * اوی که له
انگو گوی دگری : له من گوی دگری : و اوی که انگو حساب
ناکا امن حساب ناکا : و اوی که امن حساب ناکا او اوی که امنی
ناردوه حسب ناکا *
١٧ و او حفتا به خوشحالی گرانوه دیان‌گت : ای رب : به نیوی تو
١٨ جنّانیش ضوطی مه‌ن * و به وانی گت : شیطانم دی وکو بروسکه
١٩ له آسمانی دکوت * اوتا : به انگو حکماتم داوه که لسر ماران و
دویشکان پامال بکن و لسر همو قوتی دژمن : و هیچ چتیك قط
٢٠ ضرر له انگو ندا * امّا ده اویدا خوشحال مبن که روحان ضوطی
انگون : بلّا خوشحال بن که نیوانی انگو ده آسمانانذا نوسراون *
٢١ داو سعاتیدا ده روح‌القدوسدا کیفخوشی کرد و کتی : شکری
تو دکم : یا بابه : صاحبی ارض و آسمان : که اوانت له عاقلان و
زانان شاردوتوه و اوانت بو مندالان اشکرا کردوه : بلی یا بابه :

۲۲ چونکه لپیش تو وها خوش بو * همو چتانی له بابی خوم به من تسلیم
بون : و هیچکس نازانی کور کییه بجگه له باب : و باب کییه بجگه
له کور و اوی که کور بیوی بو وی اشکرا بکا *
۲۳ و بو شا گردانی بتنی ور گـَرا و کتی : خوز گه باو چاوانی که دبینن
۲٤ او چتی که انگو دبینن * چونکه به انگو دلّیم: زور پیغمبران و پادشایان
ویستویانه که ببینن او چتانی که انگو دبینن و نیان‌دیوه و که ببین
او چتانی که انگو دبین و نیان‌بیستوه *
۲۵ و اوتا : شریعتکریك هلستا و اوی تجربه دکرد دیگت : ای
۲٦ ماموستا : چی بکم که ژیانی ابدی میرات بگرم ؟ * بلّا او به وی
۲۷ گت : ده شریعتدا چی نوسراوه ؟ چلون دخوینی ؟ * بلّا او جوابی
دا و کتی : دبی رب خلّای خوت بحبینی به همو دلّت و به همـو
گیـّانت و به همو قوتت و به همو فکرت : و جیرانی خوت وکـو
۲۸ خوت * و او به وی گت : راست جوابت دا . اوی بکه و دژي ! *
۲۹ بلّا که او دیویست خوی صادق بکا به یسوعی گت : و جیرانی من
۳۰ کییه ؟ * یسوع دستی به قصان کرد و کتی : پیاویك له اورشلیمی
بو یریحوی دچو خواری و وه‌دستی جردان کوت که اویان روت کرد
۳۱ و برینداریشیان کرد و نیوه‌مردو اویان بجی هیشت و روین * و
هلکوت که کاهنیك هر باو ریی دچو خواری : و که اوی دی رابرد *
۳۲:۳۳ و هر واش لیوییکیش هاته او جیی: و که دیتی رابرد* بلّا سمارییك
۳٤ که سفریکي دکرد هاته کن اوی : و که دیتی دلّی سوتا * و چو

کنی : برینکانی پیچاوه و رون و شراپی تی کرد : و اوی لسر
اولاغی خوی سوار کرد و بردیه کاروانسرایکی و خدمتی کرد *
٣٥ و ده صبحینیدا دو دیناری در هینا : دای به خانچی و کتی : خدمتی
وی بکه : و هر چی پتر که خرج بکی امن وختیکی بیموه به تو ادا
٣٦ دکم * له او سیانه کیهه فکر دکی که جیران بو بو وی که وه‌دستی
٣٧ جردان کوت ؟ * و او کتی : اوی که رحمی به وی کرد . و یسوع
به وی گت : اتوش برو و وها بکه *
٣٨ و که اوان دچون او وه‌ژور دییکی کوت و ژنیك نیوی مرتا اوی
٣٩ ده مالی خویدا قبول کرد * و اوه خوشکیکی هبو که نیوی مریم بو
٤٠ که لکن پیانی رب رونیشت و گوی له قصی وی دگرت * بلّا مرتا
لبر زور خدمت کردن خریك بو . و هاته کنی و کتی : یا رب اری
باکت نیه که خوشکم امنی بتنی بجی هیشتوه که خدمت بکم ؟
٤١ دنا به وی بلّی که یاریدم بکا * بلّا رب جوابی دا و به وی گت :
٤٢ ای مرتا مرتا : خم دخوی و لبر زور چتانه نرحتی دکیشی * بلّا یك
چت لازمه . مریم او بشی چاکی هلبژاردوه که له وی ناستیندریتوه *

## باب ١١

١ و بو که او ده جییکیدا دعای دکرد : وختیکی خلاص بو : یکیك
له شاگردانی به وی گت : یا رب فیرمان بکه که دعا بکین چلونیکی
٢ یوحنّاش شاگردانی خوی فیر کرد * و به وانی گت : وختیکی

٣ دعا دکن بلّین : یا بابه : نیوت مقدس ببی : پادشایتی تو بی * نانی
٤ مه ای هر روژ : روژ به روژ به مه بده * و گناحانی مه ببخشه : چونکه
امَش هر قرضداریکی خومان دبخشین : و امَی ده تجریبدا مبه *
٥ و به وانی گت : کیهه له انگو دوستیکی هبی و نیوەشوی بچیته کن
اوی و به وی بلّی : ای دوست : سَی نان به قرض به من بده ! *
٦ چونکه دوستیکی من له سفریکی هاتوته کن امن و هیچم نیه که
٧ لپیشی وی دابنیم * و اوی له ژوری جواب بدا و بلّی : زحمتم مده !
در که الان داخراوه و مندالانی من د گل امن ده دوشگی دان. نا توانم
٨ هلستم و به تو بدم * به انگو دلّیم : هر چند او هلناستی و نایدا لو
سببی که دوستی وی یه : دیسان لبر روسختی وی هلدستی و هر
٩ چندیکی که محتاجه به وی ددا * امنیسش به انگو دلّیم : طلب بکن
و به انگو ددری : حول بدن و پیدا د کن : له درکی بدن و بو انگو
١٠ د کریتوه * چونکه هر کس که طلب بکا ورد گری و اوی که حول
١١ بدا پیدا د کا و بو وی که له درکی بدا د کریتوه * بلّا کیهه له انگو
که بابه اگر کوری وی ماسییکی لی طلب بکا مگر له جیاتی ماسیکی
١٢ ماریکی به وی ددا ؟ * یان اگر هیلکی لی طلب بکا مگر دوپشکیکی
١٣ به وی ددا ؟ * دنا اگر انگو که خراپن دزانن که دیاریانی چاك به
مندالانی خوتان بدن : چند زیاتر بابی آسمانی روح‌القدوس ددا به
اوانی که لی طلب بکن *
١٤ و جنّیکی وەدر خست و او لالّ بو . و بو که وختیکی او جنّه وەدر

۱٤ کوتبو او لاڵه قصی کرد و خلکی عجایب مان * بڵا هیندیك له وان
۱٦ کتیان : به بعلزبول مزنی جنّان جنّان در د کا * و ایدیکان که اویان
تجربه د کرد : نیشانیکیان له آسمانی له وی طلب د کرد *
۱۷ بڵا او خیالانی وانی زانی و به وانی گت : هر پادشایتیکی که لسر
۱۸ خوی جوی ببی خراپ دبی و مال لسر مال دروخی * و اگر شیطانیش
لسر خوی جوی بویایه پادشایتی وی چلون رادوستی ؟ چونکه انگو
۱۹ دڵین که امن به بعلزبول جنّان در د کم * و اگر امن به بعلزبول جنّان
در د کم: کورانی انگو به کی اوان در د کن؟ لبر اوی اوان حکمکرانی
۲۰ انگو دبن * بڵا اگر امن به قامکی خڵای جنّان در د کم : دنا پادشایتی
۲۱ خڵای لسر انگو گیشتوه * وختیکی او صاحب قوته له قلای خوی
به چَکَکراوی کیشکی د کیشی : مالی وی ده سلامتی دایه *
۲۲ بڵا وختیکی یکیك له وی به قوت‌تر لسر اوی بی و اوی ضوط بکا :
چکی وی دستینی که هومیدی لسر دانابو و تالانی وی بش د کا *
۲۳ اوی که د گل امن نیه : ضدی منه . و اوی که د گل امن خر نا کا
۲٤ بلاو د کا * وختیکی روحی پیس له انسانیکی وه‌در کوتوه ده جیانی
بی آو د گَری و حولی رحتی ددا . و که پیدا نا کا دڵی : د گَریموه
۲۵ بو مالی خوم که لی وه‌در کوتوم*و که دیتوه اوی مالدراو و جوان کراو
۲٦ پیدا د کا * او وختی دچی و حوت روحانی دیکه خراپ‌تر له خوی
د گل خوی هلدگری و وه‌ژور د کون و لوی دمینن و آخری او انسانی
له هولی خراپ‌تر دبی *

٢٧ و بو که وختیکی او اوانی گت : ژنیك لو غلبایی دنگی هلینا و به
وی گت : خوزگه به او مندالدانی که اتوی هلگرت و او ممکانی
٢٨ که مژتت * بلّا او کتی : ادی : بلّا خوزگه به اوانی که کلامی
خلّای دبین و رایدگرن *
٢٩ و که خلکی زور خر بونوه : دستی پی کرد که بلّی : او سلسله
سلسلیکی خراپه . نیشانـی طلب دکا و نیشانیك به وی نادری بجگه
٣٠ له نیشانـَی یونس * چونکه چلونیکی یونس بو نینویان نیشانیکی بو :
٣١ هر واش کوری انسانی بو او سلسلی دبی * ملکـَی جنوبی ده دیواندا
دگل پیاوانی او سلسلی هلدستی و حکمی لسر اوان دکا چونکه او له
پرانی ارضی هات که عقلداری سلیمان ببیی : و اوتا لیره زیاتر له
٣٢ سلیمان هیه * پیاوانی نینوی ده دیواندا دگل او سلسلی هلدستن و
حکمی لسر اوی دکن چونکه به وعظی یونس توبه‌یان کرد : و اوتا :
لیره زیاتر له یونس هیه *
٣٣ هیچکس وختیکی چرایکی هلکردوه ده جییکی دزی یان لبنّ
کیلی دانانی بلّا لسر پیچرا هتا کو اوانی که دینه ژوری روناکای
٣٤ ببینن * چرای بدن چاوته . وختیکی چاوی تو رونه همو بدنی توش
٣٥ روناکه . بلّا وختیکی خراپه بدنی توش تاریکه * دنا تماشا بکه که
٣٦ روناکای که ده تو دایه تاریك نبی * دنا اگر همو بدنی تو روناك
بی و پارچیکی تاریکی نبی : تواو روناك دبی وکو وختیکی چرایك
به شوقی خوی روناکای به تو ددا *

۳۷ بڵا وختیکی قصی د کرد فریسییکی لی طلب کرد که د گل اوی
۳۸ کاولتون بخوا و وەژور کوت و لسر سفری رونیشت * و که او فریسیه
دیتی که هولی له پیش کاولتونی دستی نشوشت : عجایب مـا *
۳۹ بڵا رب به وی گت : اویستا انگو فریسیان دروی جامی و بوشقاپی
۴۰ پاك د کن بڵا ژورِوی انگو پره له ظلم و خراپی * ای کم عاقلان :
۴۱ اوی که دروی درست کرد : اری ژوریشی درست نا کردوه ؟ * بڵا
۴۲ او چتانی ژوری صدقه بدن و اوتا همو چتی بو انگو پاکه * بڵا وای
بو انگو ای فریسیان که دەیکی نعنه و رازیانه و هر جور سبزیتی ددن
و له عدالتی و محبتی خڵای رادبرن ! اوانه لازمه که بجی بینن و که
۴۳ له اوانی دیکه رانابرن * وای بو انگو ای فریسیان که کرسی برەژور
۴۴ ده کنشتاندا خوشو دوی و سلاوان ده میدانانددا * وای بو انگو که
وکو قبرانی ونن و انسانان که لسریان دگـَرن نازانن *
۴۵ و یکیك له شرعکران جوابی دا و به وی گت : ای ماموستا :
۴۶ به کتنی اوانه امـَش سر کونه د کی * بڵا او کتی : وای بو انگوش
ای شرعکران که انسانان بار د کن به باران که به زحمت هلدگرن
۴۷ و بو خوتان به یکیك له قامکانی خوتان لو بارانی لی نادن * وای بو
انگو که قبرانی پیغمبران درست د کن : بڵا بابانی انگو اوانیـان
۴۸ کـُشت * که وایه شایدن و قایلن به عملانی بابانی خوتان چونکه
۴۹ اوان به راستی اوانیان کـُشت بڵا انگو درستی د کن * لبر اوش
عقلداری خڵای کتیَ : پیغمبران و رسولان دنیرمه کن اوان . هیندیك

۵۰ له وان د کوژن و هیندیك در د کن * هتا کو خوینی همو پیغمبران که
۵۱ له هولی دنیایی رژاوه له او سلسلی بستیندری * له خوینی هابیل هتا
خوینی زکریّا که له مابینی مذبح و هیکلی دا کوژرا . بلی به انگو
۵۲ دلّیم : له او سلسلی دستیندری * وای بو انگو ای شرعکران که هاچری
ناسینیو هلگرتوه . بو خوتان وه‌ژور ناکوتون و اوانی که وه‌ژور دکوتن
۵۳ منعو کردوه * و که او له اوی وه‌در کوت خویندواران و فریسیان
دستیان پی کرد به زور تالوکا و پرسیار لی کردن بحثی جوی جوی
۵٤ چتانی * و له وی ده کلینـدا بون که چتیك له زاری وی بگرن *

## باب ۱۲

۱ داو بینیدا وختیکی غلبایانی خلکی خر بونوه وها که یکتریان پامال
دکرد دستی پی کرد که هولی به شاگردانی خوی بلّی : هوشیار
۲ بن بو خوتان له هویرترشی فریسیان که ریاي يه * بلا هیچ چتیك
۳ شاردراو نیه که اشکرا نبی : و نه چتیك به دزی که نناسری * لبر
اوی هر چتی که ده تاریکایدا کتوتانه : ده رونا کایدا دیستری .
و اوی که ده گوی ده اوتاغاندا قصو کردوه لسر بانان وعظ دکری*
٤ بلا به انگو دوستانی خوم دلّیم : مترسین له اوانی که بدن دکوژن
۵ و له پاش اوی چتیکی دیکه ناتوانن بکن * بلا به انگو نیشان ددم که
له کی بترسین . له اوی بترسین که له پاش که کوژتویه حکماتی
هیه که ده جهنمی باویژی . بلی : به انگو دلّیم : له اوی بترسین *

٦ اری پینج چویلکان به دو پول نافروشرین ؟ و یکیك له وان لکن
٧ خلّای له بیری نچوه * بلّا مویا نی سری انگوش همو ژماردراون :
٨ مترسین : له زور چویلکان زیاترن * به انگو دلّیم : هر کس که امن
لپیش خلکی اقرار بکا : کوری انسانیش اوی لپیش ملایکتانی
٩ خلّای اقرار د کا * بلّا اوی که لکن خلکی له من حاشا بکا : لکن
١٠ ملایکتانی خلّای حاشا د کری * و هر کس که قصیکی ضدی کوری
انسانی بلّی : به وی دبخشری : بلّا به وی که ضدی روح‌القدوس
١١ کفر بلّی نابخشری * بلّا وختیکی اوان انگو دبـَنه کنشتان و لپیش
حاکمان و حکماتان : خمی مخون چلون یان چی جواب بدن یان چی
١٢ بلّین * چونکه روح‌القدوس هر داو سعاتیدا انگو فیر د کا چی لازمه
که بلّین *
١٣ و یکیك له او غلباي به وی گت : ای ماموستا : به برای من بلّی
١٤ که میراتی د گل امن بش بکا * بلّا او به وی گت : ای پیاو : کی
امنی لسر انگو قاضی یان بشکر داناوه ؟ *
١٥ و به وانی گت : تماشا بکن و هوشیار بن له همو طماکاری :
١٦ چونکه : عمری کس ده زیادی مالی ویدا نیه * بلّا مثلیکی بو وان
١٧ داهینا دیگت : مـُلکی پیاویکی دولمند حاصلی زوری هینا * و ده
خویدا فکری د کرد دیگت : چی بکم چونکه جیم نیه که حاصلی
١٨ خوم لوی خر بکم ؟ * و کتی : اوی د کم : عمبارانی خوم دروخینم
و گوره‌تر درست د کم و همو حاصل و مالی خوم لوی خر د کم *

١٩ و به گیّانی خوم دلّیم : ای گیّان : بو زور سالان زور چتانی چاك
٢٠ داندراوت هیه : رحت به : بخو : بخواوه و خوشحال به * بلّا خلّا به
وی گت : ای بی عاقل : داو شویدا گیّانی تو له تو دستینن . و او
٢١ چتانی که حاضرت کردوه بو کی دبن ؟ * هر وایه اوی که خزینیکی
بو خوی خر بکا و لکن خلّای دولمند نیه *
٢٢ و به شاگردانی خوی گت : لبر اوی به انگو دلّیم : خمی ژیانی
٢٣ مخون که چی بخون و نه بو بدن که چی دهبر بکن * چونکه ژیان
٢٤ له خوراك و بدن له جلّ زیاتره * تماشای قاژوان بکن که نه دچینن
و نه درووینی د کن : نه خلوتیان هیه و نه عمبار : و خلّا اوان بخیو د کا.
٢٥ انگو له طیران چند زیاترن * بلّا کیهه له انگو به خم خواردن دتوانی
٢٦ گزیك لسر بژنی خوی زیاد بکا ؟ * دنا اگر بو چتیکی پچوکتر
٢٧ قوتو نیه : لبر چتانی دیکه بو چی خم دخون ؟ * تماشای سویسنان
بکن چلون نه دریسن و نه دتنن : بلّا به انگو دلّیم : سلیمانیش ده
٢٨ همو جلالی خویدا وکو یکیك له اوانی دهبر نکرا بو * بلّا اگر خلّا
گیای که اورو ده زویی دایه و صبحینی ده تندوری داویژری وها
٢٩ دهبر بکا : چند زیاتر انگو ای کم ایمانان ! * و انگو حول مدن که
٣٠ چی بخون و چی بخونوه : و خیالو بلند نبی * چونکه بو همو او چتانه
طایفانی دنیایی حول ددن بلّا بابی انگو دزانی که بو اوانه احتیاجیو
٣١ هیه * بلّا پادشایتی وی طلب بکن و او چتانه بو انگو زیاد دبن *
٣٢ مترسین : ای میگلی پچوك چونکه بابی انگو راضی بوه که پادشایتی

۳۳ به انگو بدا * مالی خوتان بفروشن و صدقه بدن . کیسان بو خوتان
درست بکن که کون نبن . خزینیکی ده آسماندا که خلاص نبی .
۳٤ لکوی که نه دز نیزیك دی و نه مورانه خراپی د کا * چونکه لکوی
۳٥ که خزینی انگو یه : دلی انگوش لوی دبی * با پشتانی انگو بستراو
۳٦ بین و چرایانو هلکراو * و انگو و کو او کسانه بن که چاوه‌نوری اغای
خویانن وختیکی له داوتی دگَریتوه : هتا کو وختیکی دی و لیددا :
۳۷ زو بو وی اواله بکن * خوزگه به او خذمتکارانی که وختیکی اغا بی
اوانی وه‌خبر پیدا د کا . راستی به انگو دلیم که پشتی خوی دبستی
۳۸ و اوانی لسر سفری رودانی و دیته پیش و خذمتی وان د کا * و اگر
ده نوبی دویمدا بی : و اگر ده ای سیمدا و وها پیدا بکا : خوزگه به
۳۹ اوانه * بلا اوی بزانن که اگر خانخوی بزانیبایه ده کیهه سعاتیدا دز
٤۰ دی نیدیشت که مالی وی کُن بکری * انگوش حاضر بن چونکه
داو سعاتیدا که فکر ناکن : کوری انسانی دی *
٤۱ بلا پطروس کتی : یا رب : اری او مثلی به مه دلّي یان بـه
٤۲ هموانیش ؟ * و رب کتی : دنا کییه او ناظری امین و عاقل که
اغا لسر خذمتکارانی خوی دادنی هتا کو خوراکی تاعین کراو ده
٤۳ وختی خویدا به وان بدا ؟ * خوزگه به او عبدی که اغای وی وختیکی
٤٤ دی دبینی که وها د کا * به راستی به انگو دلیم : که اوی لسر همو
٤٥ مالی خوی دادنی * بلا اگر او عبده ده دلی خویدا بلّی : اغای من
هاتنی خوی درنگ د کا و دست پی د کا که له نو کران و قره‌واشان

٤٦ بدا و که بخوا و بخواتوه و مست ببی * اغای او عبدی دی ده روژیکدا
که چاوه‌نور نبی و ده سعاتیکیدا که نزانی و اوی دو لت د کا و بشی
٤٧ وی د گل بی ایمانان دادنی * بلّا او عبدی که ارادی اغای خوی
زانی و حاضری نا کرد : یان و کو ارادی وی نا کرد : قامچی زوری
٤٨ لی ددری * امّا اوی که نازانی بلّا لایقی قامچیانی کرد قامچی کمی
لی ددری . و هر کس که زوری دراوه : له وی زور دستیندری :
و اوی که زور به وی تسلیم بوه له وی پتر طلب د کری *
٤٩ هاتوم که آوریکی لسر ارضی باویژم و چم دوی اگر الان هلکرا
٥٠ بایه ? * بلّا تعمیدیکم هیه که پی تعمید بکریم : و چند تنگانم هتا
٥١ خلاص دبی * اری فکر د کن که هاتوم صلح لسر ارضی بدم ? به
٥٢ انگو دلّیم : نه خیر بلّا جوی بونوی * چونکه له وی پاش ده یك مالدا
٥٣ پینج جوی دبنوه : سَی لسر دو و دو لسر سَی * باب لسر کوری
و کور لسر بابی : دایك لسر کچی و کچ لسر دایکی : خسوی
لسر بوکی خوی و بوك لسر خسوی جوی دبنوه *
٥٤ و به خلکیشی گت:وختیکی دبینن که هوریکی ده لای روژ آوایدا
٥٥ بلند دبیتوه : زو دلّین که باران دی : و وها دبی * و وختیکی بای
٥٦ جنوبی لیددا دلّین که گرم دبی : و دبی * ای ریا کاران : روی ارض
و آسمان دزانن که سوارغ بکن : بلّا او زمانه چلون اوی سوراغ
٥٧ نا کن * و بو چی له خوتانیش حکم نا کن او چتی که حقه ? *
٥٨ چونکه وختیکی د گل مدعی خوت بو کن حاکم دچی : ده ریدا

سعی بکه که له اوی خلاص بی : نبا اتو بو کن قاضی بکیشی و
قاضی اتو به داروغه تسلیم بکا و داروغه اتو ده بندیخانی باویژی *
٥٩ به تو دڵیم : قط له اوی وەدر ناکوي هتا پولی آخریشت ادا نکردوه *

باب ١٣

١ و داو وختیدا هیندیك لوی بون که به وی خبریان دا بحثی او
جلیلیان که پیلاطوس خوینی وان د گل قربانانی وان تیکلی کردبو *
٢ و جوابی دا و به وانی گت : اری فکر د کن که او جلیلیانه له همو
٣ جلیلیان گناحکارتر بون چونکه او چتانەیان کیشاوه ؟ * به انگو دڵیم:
٤ نه خیر : بلا اگر توبی نکن هموتان هر وا هلاك دبن * یان او هژدانی
که بُرجی ده سلوامدا کوته سریان و اوانی کُشت : اری فکر د کن
که اوان له همو کسانی که ده اوریشلیمیدا دژین خطادارتر بون ؟ *
٥ به انگو دڵیم : نه خیر : بلا اگر توبی نکن هموتان هر وا هلاك دبن *
٦ و او مثلی گت : کسیك دارەهنجیریکی چقاندراو ده رزی خویدا
٧ هبو و هات و حولی میوی له وی ددا و پیدای نکرد * و به رزوانی
گت : اوتا سی ساله که دیم و لو دارەهنجیری حولی میوی ددم
٨ و پیدا ناکم . اوی ببره : بو چی ارضیش بطال د کا ؟ * بلا او جوابی
دا و به وی گت : ای اغا او سالیش لی گری هتا دوری وی هلبکنم
٩ و زبلی تی بکم * و اگر میوی بینی له پاش اوی : چاك : بلا اگر نه :
اوی ببری *

١٠:١٠ و ده شموی ده یکیك له کنشتاندا تعلیمی ددا * و اوتا : ژنیك
هبو که هژده سال روحیکی ضعیفی بو و کُور بو و نیدتوانی خوی
١٢ تواو راست بکاتوه * بلّا وختیکی یسوع اوی دی بانگی کرد و به
١٣ وی گت : ای ژن : له ضعیفی خوت رد بوی * و دستانی لسر اوی
١٤ دانا و جی بجی راست بووه و شکری خـلّای دکرد * بلّا گوری
کنشتی که ناقایل بو چونکه یسوع ده شمویدا صاغ دکردوه : جوابی
دا و به خلکی گت : شش روژ هن که ده واندا لازمه که کار بکن.
١٥ دنا ده واندا ورین و صاغ ببنوه و نه ده روژی شمویدا * بلّا رب به
وی جوابی دا و کتی : ای ریاکاران : اری هر یکیك له انگو ده
شمویدا گای خوی یان کری له آخوری ناکاتوه و نایبا که آوی بدا؟*
١٦ بلّا اوه که کچی ابراهیمه : که شیطان بستویه اوتا هژده سال : اری
١٧ واجب نیه که ده روژی شمویدا لو بندی بکریتوه ؟ * و که او چتانی
گت : همو اوانی که ضدی وی بون شرمیبان کرد و همو خلکی
خوشحال دبون له سر همو چتانی جلالدار که به وی دکران *
١٨ او وختی کتی : پادشایتی خلّای به چی دشبهی و بـه چی اوی
١٩ بشبهینم ؟ * دشبهی به دنکیکی خردل که پیاویك گرتی و ده باغچی
خویدا هاویشتی و گوره بو و بو به داریك و طیرانی آسمان ده لکانی
٢٠ ویدا هلنیشتن * و دیسان کتی : اری پادشایتی خلّای به چی بشبهینم؟*
٢١ دشبهی به هویرترشیکی که ژنیك گرتی و ده سَی کیلی آردیدا
شاردیوه هتا همو ترشا *

٢٢ و دنیو شاران و دییاندا دگَرا : تعلیمی ددا و بو لای اورشلیمی
٢٣ دچو * و کسیك به وی گت : یا رب : اری کمن که خلاص دبن ؟
٢٤ بلّا او به وانی گت : زحمت بکیشن که له درکی تنگ وەژور
بکون : چونکه به انگو دلّیم : زوران سعی دکن که وەژور بکون
٢٥ و ناتوانن * له پاش اوی که خانخوی هلستاوه و درکی داخستوه و
انگو دست پی دکن که له دری راوستن و له درکی ددن و بلّین :
یا رب بو مه بیکوه ! و جواب ددا و به انگو دلّی : انگو ناناسم له
٢٦ کوین * او دمی انگو دست پی دکن که بلّین : له بر چاوی تومان
٢٧ خواردوه و خواردومانوه و ده کوچی مەدا تعلیمت داوه * و او دلّی :
به انگو دلّیم : ناناسم له کوین : له من دور بن ای همو ناحقکران *
٢٨ لوی گریان و جیراندنی ددانان دبی وختیکی ابراهیم و اسحق و
یعقوب و همو پیغمبران ده پادشایتی خلّایدا بلّا خوتان در کراو دبینن *
٢٩ و له روژ هلاتی و روژ آوای : و له شمال و جنوب دین و لسر سفری
٣٠ ده پادشایتی خلّایدا رودنیشن * و اوتا آخران هن که هول دبن و
هولان هن که آخر دبن *

٣١ داو سعاتیدا چند فریسیان هاتنه پیش و به وییان گت : وەدر
٣٢ بکوه و برو له ایره : چونکه هیرودیس طمای هیه اتو بکوژی * و به
وانی گت : برون و باو ریوی بلّین : اوتا جنّان در دکم و صاغیتی
٣٣ دکم اورو و صبحینی : و ده روژی سَیمدا خلاص دبم * بلّا بو من
لازمه که اورو و صبحینی و ده روژی دیدا بگَرم : چونکه نابی که

٣٤ پیغمبریك له اورشلیمی به در هلاك ببی * ای اورشلیم اورشلیم که
پیغمبران دکوژی و اوانی که ناردراونه کن اتو بردەباران دکی :
چند جاران ویستم که مندالانی تو خر بکمَوه چلونیکی مریشك
٣٥ جوچکان لبن بالانی خوی خر دکاتَوه و نتانویست * اوتا : مالو بو
انگو ویران دمینی : و به انگو دلّیم : قط امن نابینن هتا او وختی
بی که دلّین : ممبارك بی اوی که به نیوی رب دی *

## باب ١٤

١ و بو که وختیکی او وەژور مالی یکیك له مزنانی فریسیان ده
٢ شمویدا کوت که نان بخوا و اوان له وی سیاد بون * و اوتا پیاویك
٣ ایسقادار لپیش اوی هبو * و یسوع جوابی دا و به شرعکران و فریسیان
قصی کرد دیگت : اری ده شمویدا صاغ کردنَوه درسته یان نه ؟ *
٤ بلّا اوان بی دنگ بون . و گرتی : اوی صاغ کردوه و بری دا *
٥ و به وانی گت : کیهه له انگو که کوری یان گای ده چالیکیدا بکوی
٦ و جی بجی ده روژی شمویدا اوی در ناکیشی ؟ * و نیاندتوانی
جوابی او چتانی بدن *
٧ بلّا بو بانگ‌ایشتراوان مثلیکی داهینا وختیکی دیتی چلون جیانی
٨ ژورویان هلدبژارد . به وانی دیگت * وختیکی له کسیك بو داوتی
بانگ ایشترای : ده جیی ژورودا رومنیشه : نبا یکیك له تو محتبرتر
٩ له وی بانگ ایشترا بی * و اوی که اتو و اوی بانگ ایشتوه بی و به

تو بلّی : جی به وی بده : و او دمی به شرمی دست پی د کی که
۱۰ جیی خواری بگری * بلّا وختیکی بانگت ایشترای : برو ده جیی
خواری روبنیشه هتا کو وختیکی اوی که اتوی بانگت ایشتوه بی و به
تو بلّی : ای دوست : وره ایره ژوروتر . او دمی حرمتت دبی ده
۱۱ پیش همو اوانی که د گل اتو لسر سفری رودنیشن * چونکه هر
کس که خوی بلند بکا نوی د کری : و اوی که خوی نوی بکا
بلند د کری *
۱۲ بلّا به اویش که اوی بانگت ایشتبو کتی : وختیکی کاولتونیکی
یان شامیکی درست د کی : دوستانی خوت یان برایانی خوت یان
خزمانی خوت یان جیرانانی دولمند بانگت مکه : نبا که اوانیش
۱۳ اتو بانگت بکنوه و طوله بو تو ببی * بلّا وختیکی میمانی د کی :
۱٤ فقیران : نقستانان : شلان و کویران بانگت بکه * و خوزگه دبي :
چونکه هیچیان نیه که طوله به تو بدن . چونکه ده قیامتی صادقاندا
طوله به تو ددری *
۱۵ و که یکیك له رونیشتوان لسر سفری د گلی او چتانی بیست :
۱٦ به وی گت : خوزگه به اوی که ده پادشایتی خلّایدا نان دخوا * بلّا
او به وی گت : پیاویك شامیکی گوری درست کرد و زورانی
۱۷ بانگت ایشت * و ده وختی شامیدا خذمتکاری خوی نارد که به
۱۸ بانگت‌ایشتراوان بلّی : ورن چونکه الان حاضره * و همویان به یك
قول دستیان پی کرد به بیانو هینانی : ای هول به وی گت : زوییکم

کریوه و لازمه بو من که بچم اوی ببینم . تکات لی د کم که بخشراو
۱۹ حسابم بکه * و اوی دیکه کتی : پینج جوت گام کریوه و دچم که
۲۰ اوانی تجربه بکم . تکات لی د کم که بخشراو حسابم بکه * و ایدیکه
۲۱ کتی : ژنیکم هینا و لبر اوی ناتوانم بیم * و خذمتکار که هاتَوه و او
چتانی به اغای خوی خبر دا . او دمی خانخوی رقی هلستا و بــه
خذمتکاری خوی گت : به زوی وەدر بکوه ده کوچان و میدانانی
شاریدا و فقیران و نقستانان و کویران و شلان بینه ژوری ایره *
۲۲ و او خذمتکاره کتی : ای اغا : او چتیِ که امرت کردوه بوه و هیشتا
۲۳ جی هیه * و اغا باو خذمتکاری گت : وەدر بکوه ده ریان و قراغاندا
۲٤ و مجبوریان بکه که وەژور بکون هتا کو مالی من پر ببی * چونکه
به انگو دلّیم که هیچکس لو پیاوانی که بانگ ایشترا بون : شامی
من ناچیژن *
۲۵ و خلکی زور د گل اوی دچون . و ورگَرا و به وانی گت :
۲٦ اگر کسیك بیته کن امن و باب و دایك و ژن و مندالان و برایان
و خوشکانی خوی و ژیانی خوشی نبغضینی : ناتوانی شاگردی من
۲۷ ببی * و هر کس که سیداری خوی هلنگری و له دوای من نیی
۲۸ ناتوانی شاگردی من ببی * چونکه کیهه له انگو که بیوی بُرجیکی
درست بکا هولی رونیشی و خرجی حساب نکا اگر بو تواو کردنی
۲۹ وی هیتی ? * نوکو که وختیکی بناغی وی داناوه و نتوانی تواوی
۳۰ بکا هموان که دینن دست پی بکن که مسخاره به وی بکن * و

بلّین که او پیاوه دستی پی کرد که درست بکا و نیتوانی تواوی بکا *
۳۱ یان کیهه پادشا که دچی که دگل پادشایکی دیکه شری بکا هولی
رونیشی و تگبیر نکا اگر به ده هزار دتوانی برامبری وی بچی که به
۳۲ بیست هزار لسر اوی دی ؟ * و اگر نه : وختیکی او هیشتا دوره
۳۳ قاصدیکی دنیری و شرطی صلحی طلب دکا * دنا هر وها هر کس
له انگو که دست له همو چتی ایخوی هلنگری ناتوانی شاگردی من
ببی *
۳٤ دنا خُوی چاکه : بلّا اگر خُویش بی تام ببی : بــه چی سویر
۳۵ دکری ؟ * نه بو ارضی به کار دی و نه بو سر گویلکی : بلّا فری
ددنه دری . اوی که گوی بیستنی هیه با ببیی *

باب ۱۵

۱ بلّا همو راداران و گناحکاران نیزیکی وی دبون که گوی لی
۲ بگرن * و فریسیان و خویندواران بولهبولیان دکرد دیان گت : اوه
گناحکاران قبول دکا و دگل اوان دخوا *
۳:٤ بلّا او مثلی بو وان داهینا دیگت * کیهه کس له انگو که صد
مری هبی و یکیك له وان ون بکا : او نوت و نوی ده چولیدا بجی
۵ نایلی و له دوای اوی که ون بوه ناچی هتا اوی پیدا بکا ؟ * و که
٦ پیدای کردوه به خوشحالی لسر شانانی خوی دادنی * و که دیته
مالی : دوستان و جیرانان بانگ دکا و به وان دلّی : دگل امن

۷ خوشحال بن چونکه مری خوم که ون بو پیدام کردوه * به انگو دڵیم :
که هر واش ده آسماندا خوشحالی دبی له سر یك گناحکار که توبه
۸ دکا پتر له لسر نوت و نو صادقان که محتاجی توبی نین * یان کیهه
ژن که ده درهمی هبی اگر یك درهم ون بکا چرای هلنا کا و مالی
۹ گسك لی نادا و به وردی لی ناگری هتا اوی پیدا بکا ؟ * و که
پیدای کردوه : دوستان و جیرانان بانگ دکا و دڵی : دگل امن
۱۰ خوشحال بن چونکه او درهمی که ونم کردبو پیدام کردوه * به انگو
دڵیم : که هر وها ده پیش ملایکتانی خڵایدا خوشحالی دبی له سر
یك گناحکار که توبه دکا *

۱۲:۱۱ و کتی : پیاویك دو کوری هبو * و او چکوله‌تری وان به بابی
گت : ای بابه : او بشی مالی که بو من دکوی به من بده ! و مالی
۱۳ بو وان بش کرد * و چند روژان له پاش اوی او کوری چکوله‌تر همو
چتی خر کرد و بو ولاتیکی دور چو و لوی مالی خوی به لوطیگری
۱٤ خسار کرد * بڵا وختیکی او همو چتی فوتاندبو قاطییکی گوره داو
۱٥ ولاتیدا پیدا بو و او دستی پی کرد که محتاج ببی * و چو خوی به
یکیك له اهلی او ولاتی چسپاند : و او اوی نارده زویانی خوی که
۱٦ برازان بلویرینی * و ارزوی دکرد که زگی خوی پر بکا له خرنوکانی
۱۷ که برازان دیانخوارد و کس به وی نددا * بڵا وختیکی له سر خوی
هات کتی : چند کریکارانی بابی من نانی زیادیان هیه بڵا امن لیره
۱۸ له برسان هلاك دبم * هلدستم و دچیمه کن بابی خوم و به وی دڵیم :

۱۹ ای بابه : گناحم کردوه لسر آسمان و ده پیشتی تو * ایدی لایق
نیم که کوری تو بانگ بکریم : امن وکو یکیك له کریکارانی
۲۰ خوت بکه * و هلستا و هاته کن بابی خوی . بلّا وختیکی او هیشتا
دور بو : بابی وی دیتی و دلّی سوتا و لنگی دا و کوته سر استوی
۲۱ وی و زوری ماچ کرد * و کورکه به وی گت : ای بابه : گناحم
کردوه لسر آسمان و ده پیشی تو : ایدی لایق نیم که کوری تو
۲۲ بانگ بکریم * بلّا بابکه به خذمتکارانی خوی گتَ : جلّی له هموان
چاتر زو درینن و ده‌بر اوی بکن و انگوستیلیکی ده دستی وی بکن
۲۳ و کوشان ده پیانی * و جوانه گای قلاو بینن : سری ببرن و با بخوین
۲٤ و کیفخوش ببین * چونکه او کوری من مردو بو و زندو بووه : ون
۲۵ بو و پیدا : بووه . و دستیان پی کرد که کیفخوش ببن * بلّا کوری
گوری وی ده زوییدا بو . و که نیزیکی مالی دهات : دنگی بزم
۲٦ و سمای بیست * و یکیك له نوکرانی بانگ کرد و پرسیاری کرد
۲۷ که او چته چی بی * و او به وی گت : که برای تو هاتوه و بابی تو
جوانه گای قلاوی سربریوه : لبر اوی که اوی به صاغ و سلامتی
۲۸ ورگرتوه * و رقی هلستا و نیویست که وه‌ژور بکوی : بلّا بابی وی
۲۹ وه‌در کوت و لی پاراوه * بلّا او جوابی دا و به بابی گت : اوتا :
چند سال خذمتی تو دکم : و قط له امری تو در نکوتوم : و قط
کاریلیکت به من نداوه هتاکو دگل دوستانی خوم کیفخوشی بکم *
۳۰ امّا وختیکي او کوری تو هات که مالي تو دگل قاحبان خواردوه :

۳۱ جوانه گای قلاو بو ویت سربریوه * بلّا او به وی گت : ای روله :
۳۲ اتو همیشه د گل امنی و همو چتی من ایتو یه * امّا کیفخوش کردن
و خوشحال بونی لازیمه چونکه او برای تو مردو بو و زندو بووه و ون
بو و پیدا بووه *

## باب ۱٦

۱ بلّا به شاگردانیشی گت : پیاویکی دولمند هبو که ناظریکی بو
و او لکن اوی گلیی لی کرا بو وکو یکیکی که مالی وی خسار
دکرد * و اوی بانگ کرد و به وی گت : اوه چیه که بحثی تو
دییم ? حسابی ناظریتی خوت بده : چونکه ایدی ناتوانی ناظریتی
۳ بکی * بلّا او ناظره ده خویدا کتی : چی بکم ? چونکه اغای من
ناظریتی له من دستینی . ناتوانم که هلبکنم و شرمی دکم که سوال
٤ بکم * دزانم چی بکم هتاکو وختیکی له ناظریتی در کراوم امن ده
٥ مالانی خویاندا قبول بکن * و هر یکیکی له قرضدارانی اغای خوی
٦ بانگ کرد و به ای هولی گت : به اغای من چند قرضداری ? * و
او کتی : صد باتمان رون . بلّا او به وی گت : سیای خوت بگره
۷ و رونیشه و زو پینجای بنوسه * له پاشان به یکی دیکی گت : بلّا
اتو چند قرضداری ? و او کتی : صد بار گنم . به وی گت : سیای
خوت بگره و هشتای بنوسه *
۸ و اغا لو ناظری ناحق آفرینی کرد که به عقلی کار کردبو .

چونکه کورانی او دنیایی دگل سلسلی خویان عاقلترن له کورانی
۹ روناکای * امنیش به انگو دلّیم : به ماموناى ناحقى دوستان بو
خوتان پیدا بکن هتا کو وختیکی او خلاص دبی : انگو ده خیوتانی
۱۰ ابدیدا قبول بکن * اوی که ده کم دا امینه : ده زوریشدا امینه : و اوی
۱۱ که ده کم دا ناحقه : ده زوریشدا ناحقه * دنا اگر ده ماموناى ناحقدا
۱۲ امین نبوياين کی اوی حق به انگو دسپیری ؟ * و اگر ده ایدیکیدا
۱۳ امین نبوياين کی ایخوتان به انگو ددا ؟ * هیچ خذمتکار ناتوانی
خذمتی دو اغایان بکا : چونکه یان یکیکی دبغضینی و اوی دیکه
دحبینی : یان تابعی یکیکی دبی و اوی دیکه سوك دژمیری . انگو
ناتوانن خذمتی خلّاى و ماموناى بکن *
۱٤ بلّا فریسیان که دراودوست بون همو او چتانه‌یان بیست و مسخاره‌یان
۱۵ به وی دکرد * و او به وانی گت : انگو اوانن که خوتان ده پیش
خلکیدا صادق دکن بلّا خلّا دلّو دناسی : چونکه او چتی که لنیو
خلکی بلنده : ده پیش خلّایدا ناحزه *
۱٦ شریعت و پیغمبران هتا یوحنّا بون . له او وختیوه مزگینی پادشایتی
۱۷ خلّای ددری . و هر کس به زوری وه‌ژور اوی دکوی * بلّا هاسانتره
که ارض و آسمان رابیرن له وی که یك نخته له شریعت بکوی *
۱۸ هر کس که ژنی خوی برلا بکا و یکی دیکه ماره بکا زناح دکا :
و اوی که برلا کراویکی له میردی ماره بکا زناح دکا *
۱۹ بلّا پیاویکی دولمند هبو و ارغوان و کتانی ده‌بر دکرد و هر

٢٠ ژور به عیشی کیفخوشی دکرد * و فقیریك هبو : نیوی ایلعازر : که
٢١ بریندار له بر درکی وی هاویشترا بو * و ارزوی دکرد که خوی تیر
بکا لو چتانی که له سفری او دولمندی دکوتن . بلاّ سگانیش دهاتن
٢٢ و برینکانی ویان دلستوه * بلاّ بو که او فقیری مرد و به ملایکتان بو
٢٣ باوشی ابراهیمی بردرا . بلاّ دولمند کش مرد و نشترا * و که چاوانی
خوی ده عالمی مردواندا هلینا که ده عاذابابدا بو : له دوروه ابراهیمی
٢٤ دی و ایلعازر ده باوشی ویدا * و او قیژاندی و کتی : ای بابه ابراهیم:
رحمی به من بکه و ایلعازر بنیره هتاکو سری قامکی خوی ده آوی
٢٥ بخا و زمانی من فینك بکا چونکه داو هالاویدا عاذاب دکیشم * بلاّ
ابراهیم کتی : ای روله : وەبیرت بینه که چتانی چاکی خوت ده
عمری خوتدا ورت گرت و هر وها ایلعازر چتانی خراپ . بلاّ اویستا
٢٦ او لیره دلّخوشی ددری و اتو عاذاب دکیشی * و لسر همو او چتانی :
ماینی مه و انگو خندقیکی گوره قایم کراو هیه هتاکو اوانی که
دیانوی له ایره بو کن انگو رابرن نتوانن و نەش له اوی بو کن
٢٧ امه رابرن * بلاّ او کتی : دنا تکات لی دکم : ای بابه : که اوی
٢٨ بو مالی بابم بنیری * چونکه پینج برام هیه : هتاکو شایدی چاك به
٢٩ وان بدا : نبا اوانیش بو او جي عاذابی بین * بلاّ ابراهیم کتی :
٣٠ موسی و پیغمبرانیان هیه . با گوی له وان بگرن * بلاّ او کتی : نه
خیر : ای بابه ابراهیم : بلاّ اگر یکیك له مردوان بو کن اوان بروا :
٣١ توبه دکن * بلاّ او به وی گت : اگر له موسی و پیغمبران گوی ناگرن

باوریش نا کن اگر یکیك له مردوان هلبستیتوه *

باب ١٧

١ و به شاگردانی خوی گت : نامکنه که هل‌انگوتنان نین : بلا
٢ وای بو اوی که به سببی وی دین * بو وی چاتر دبو اگر برداشیك ده
استوی وی بخرابایه و ده بحری باویژرابایه له وی که یکیك لو
٣ چکولانه هلبنگوینی * له خوتان اگادار بن . اگر برای تو گناح بکا :
٤ اوی مذمّت بکه . و اگر توبَی بکا : اوی ببخشه * و اگر روژی
حوت جاران لسر اتو گناح بکا و حوت جاران بو کن اتو بگَریتوه
و بلّی : توبَی دکم : اوی ببخشه *
٥:٦ و رسولان به رب کتیان : ایمانی مه زیاد بکه * بلّا رب کتی :
اگر وکو دنکیکی خردل ایمانو هبایه : باو داره توی دتان گت :
هلبکندری و ده بحریدا بچقیندری : و اطاعتی انگوی دکرد *
٧ بلّا کیهه له انگو که عبدیکی هبی که جوتی یان شوانی دکا :
که وختیکی له زویی بیتوه به وی بلّی : زو وره ایره و لسر سفری
٨ رونیشه ؟ * بلّا اری به وی نالّی : چتیکی حاضر بکه که شام بخوم
و پشتی خوت ببسته و خذمتی من بکه هتا بخوم و بخوموه : و له پاشان
٩ اتو بخو و بخووه ؟ * مگر لو عبدی منّت هلدگری چونکه او چتانی
١٠ که امر کران بجی هینا ؟ * هر واش انگو وختیکی همو چتانی که به
انگو امر کراون کردوتانه بلّین : عبدانی بی فایده هین . او چتی
که بو مه واجب بو که بیکین کردومانه *

١١ و بو كه وختيكى بو اورشليمى دچو : ده ماينى سماريه و جليليدا
١٢ رادبرد * و كه او وەژور دييكى دكوت : ده پياوى گول توشى وى
١٣ بون كه له دوروه راوستان * و اوان دنگيان هلينا ديان گت : اى يسوع
١٤ ماموستا : رحمى به مه بكه * و وختيكى اوانى دى به وانى گت :
برون و خوتان بو كاهنان نيشان بدن . و بو كه وختيكى اوان دچون
١٥ پاكـ بونوه * بڵا يكيكـ له وان : وختيكى ديتى كه صاغ بووه گـَراوه
١٦ و به دنگيكى بلند شكرى خڵاى دكرد * و له بر پيانى وى به سر رو
١٧ دا كوت و منّتى لى هلدگرت . و او سمارى بو * بڵا يسوع جوابى
١٨ دا و كتى : ارى او دەيانه پاكـ نابونوه ؟ او نويانه لكوين ؟ * ارى
پيدا نابون كه بگـَرينوه كه شكرانه به خڵاى بدن بجگه لو غريبه ؟ *
١٩ و به وى گت : هلسته برو. ايمانى تو اتوى خلاص كردوه *
٢٠ و كه له فريسيان پرسيارى لى كرا كه پادشايتى خڵاى كنگى دى:
جوابى به وان دا و كتى : پادشايتى خڵاى به ديتنى اشكرا نايى *
٢١ و ناشڵين : اوتا ليره يان لوى : چونكه اوتا : پادشايتى خڵاى لنيو
انگو يه *
٢٢ بڵا به شاگردانى گت : روژان دين كه ارزو دكن كه يكيكـ له
٢٣ روژانى كورى انسانى ببينن و نايبينن * و به انگو دڵين : اوتا ليره :
٢٤ مچن و وەدواى مكون * چونكه چلونيكى بروسكه وختيكى دبروقى
له لايكـ لبن آسمان هتا بو لايكى ديكه لبن آسمان شوق ددا : هر
٢٥ واش كورى انسانى ده روژى خويدا دبى * بڵا هولى بو وى لازمه

٢٦ که اذیتانی زور بکیشی و له او سلسلی رد بکری * و چلونیکی ده
روژانی نوحدا بو : هر واش ده روژانی کوری انسانیــدا دبی *
٢٧ دیان‌خوارد و دیان‌خواردوه : ماریان دکرد و ماره دکران هتا او روژی
که نوح وه‌ژور گمی کوت و طوفان هات و همویانی هلاك کرد *
٢٨ هر وکو ده روژانی لوطیشدا بو : دیان‌خــوارد و دیان‌خــواردوه :
٢٩ دیان‌کری و دیان‌فروت : دیان‌چاند و درستیان دکرد * بلّا داو روژیدا
که لوط له سدومی وه‌در کوت آور و گوگرد له آسمانی باری و
٣٠ همویانی هلاك کرد * هر واش دبی داو روژیدا که کوری انسانی
٣١ اشکرا دبی * داو روژیدا اوی که لسر ابنی دبی و اسبابانی وی ده
مالی دان : با نیته خواری که اوانی هلبگری . و هر وا اوی که
٣٢ ده زوی دایه : با نگـریته او چتانی پاشوه * ژنی لوط وه‌بیرو بینن *
٣٣ هر کس که بیوی که گیـّانی خوی خلاص بکا ونی دکا و هر
٣٤ کس که ونی بکا : زندوی دکاتوه * به انگو دلّیم : ده اوی شویدا
دو لسر یك دوشگ دبن : یکیك دستیندری و اوی دیکه بجی
٣٥ دهیشتری * دو ژن دبن که پیکوه دستار دکن : یکیك دستیندری
٣٦ بلّا اوی دیکه بجی دهیشتری * دو ده زوییـــدا دبن : یکیــك
٣٧ دستیندری و اوی دیکه بجی دهیشتری * جوابیان دا و به ویان گت :
لکوی ای رب ؟ بلّا او به وانی گت : هر جییکی که کلاك بی
لوش دالان خر دبنـوه *

## باب ١٨

١ و مثليكى بو وان داهينا له سر اوى كه لازمه كه هميشه دعا بكن
٢ و عاجز نبن * ديگت : ده شاريكيدا قاضييك هبو كه له خلاى ندترسا
٣ و له انسانى شرمى ندكرد * و بيوەژنيك داو شاريدا هبو . و دهاته
٤ كن اوى ديگت : حقم بو بستينه له مدعى خوم * و هتا زمانيكى زور
نيدويست . بلا له پاشان ده خويدا كتى : هر چند له خلاى ناترسم و له
٥ انسانى شرمى ناكم * ديسان چونكه او بيوەژنه زحمتم ددا : حقى بو
٦ دستينم : نبا ده آخريدا بى و ليم بدا * و رب كتى : ببين كه او
٧ قاضى ناحق چى دلى * بلا مگر خلا حقى هلبژيراوانى خوى كه شو
و روژ له وى دپارينوه ناستينى ؟ و مگر د گل اوان درنگى د كا ؟ *
٨ به انگو دليم كه حقى وان به زوى دستينى . بلا وختيكى كورى
انسانى دى مگر ايمان لسر ارضى پيدا د كا ؟ *
٩ بلا به هينديكان كه هوميديان لسر خويان دانا كه صادق بون و
١٠ ايديكانيان به سوكى دژمارد : او مثلى گت * دو كس بو هيكلى
وەسر كوتن كه دعا بكن . بكيك فريسى بو و اوى ديكه رادار *
١١ فريسيكه راوستا و د گل خوى وها دعاى د كرد : يا خلا : شكرى تو
د كم كه وكو انسانانى ديكه نيم : جردان : ناحقان : زناحكاران
١٢ يان وكو او رادارش * حوتوى دو جار روژو د گرم : له همو چتى
١٣ كه قازانج د كم دەيك ددم * امّا رادار كه له دوروه راوستا و نيدويست

چاوانیشی بو آسمانی هلینی : بلّا له سنگی خوی دا دیگت : یا خلّا
۱٤ به من گناحکار رحمی بکه * به انگو دلّیم : اوه صادق کراو بو مالی
خوی وەخوار چو پتر له اوی دیکه : چونکه هر کس که خوی بلند
بکا نیوی دکری : و اوی که خوی نوی بکا بلند دکری *
۱۵ و طفلانیشیان هینا کن اوی که دستی له وان بدا : بلّا وختیکی
۱٦ شاگردان دیتیان له وان تُند بون * بلّا یسوع اوانی بانگ کرد دیگت:
له مندالان گرین که بینه کن امن و منعیان مکن چونکه پادشایتی
۱۷ خلّای ای او طرزانه یه * راستی به انگو دلّیم : هر کس که وکو
مندالیك پادشایتی خلّای قبول نکا قط وەژور اوی ناکوی *
۱۸ و یکیك له مزنان پرسیاری لی کرد دیگت : ای ماموستای چاك :
۱۹ چی بکم که ژیانی ابدی میرات بگرم ؟ * بلّا یسوع به وی گت :
بو چی به من دلّي چاك ؟ هیچکس چاك نیه بجگه له یکیك یعنی خلّا*
۲۰ حکمان دزاني : زناحی مکه : قتلی مکه : دزي مکه : شایدی به
۲۱ درو مده : حرمتی باب و دایکی خوت بگره * و او کتی : اوانم
۲۲ همو له جحیلیوه راگرتوه * بلّا وختیکی یسوع بیستی : به وی گت :
هیشتا چتیکت کمه . هر چی که هته بفروشه و به فقیرانی بده و
۲۳ خزینیکت ده آسماندا دبی و وره وەدوای من بکوه * امّا وختیکی
۲٤ اوی بیست زور خمناك بو چونکه زور دولمند بو * بلّا وختیکی یسوع
اوی دی کتی : چند زحمته بو وان که دولتیان هیه که وەژور پادشایتی
۲۵ خلّای بکون * چونکه هاسانتره که وشتریك به کُنی درزی تیوه

٢٦ بچی له وی که دولمندیك وەژور پادشایتی خلّای بکوی * و اوانی که
٢٧ بیستیان کتیان : دنا کی دتوانی خلاص ببی ؟ * بلّا او کتی : او
چتانی که لکن خلکی نامکنه لکن خلّای ممکنه *
٢٨ و پطروس کتی : اوتا امه چتي خومان بجی هیشتوه و وەدوای
٢٩ تو کوتوین * بلّا او به وانی گت : راستی به انگو دلّیم : هیچکس
لبر خاطری پادشایتی خلّای بجی نهیشتوه مال یان ژن یان برایان یان
٣٠ والدین یان اولاد * که زور جار اوندوه ورنگری و داو دنیایی که
دی ژیانی ابدی *
٣١ بلّا او دوازدانی هلگرت و به وانی گت : اوتا وەسر دکوین بو
وارشلیمی و همو چتانی که به پیغمبران درحقی کوری انسانی
٣٢ نوسراون تواو دبن * چونکه به بت‌پرستان تسلیم دکری و گپی
٣٣ پی ددری و بی حرمت و تفی لی دکری * و که قامچییان لی داوه :
٣٤ دیکوژن و ده روژی سیمدا هلدستیتوه * و اوان هیچ چتیك لو چتانی
نیان‌فامی و او قصه له وان شاردراو بووه و تی نگیشتن او چتانی که
کتران *
٣٥ و بو که وختیکی او نیزیکی یریحو هات : کویریك لسر ریی
٣٦ رونیشتبو و سوالی دکرد * بلّا وختیکی بیستی که غلبای رادبرد :
٣٧ پرسیاری کرد که اوه چیه * و خبریان به وی دا که یسوع ناصری
٣٨ رادبری * و قیژاندی دیگت : یا یسوع کوری داود : رحمی به من
٣٩ بکه * و اوانی که ده پیشدا دچون له وی تُند بون که بی دنگ بی .

٤٠ بلّا اوز هر پتر قیژاندی : یا کوری داود : رحمی به من بکه * و یسوع
راوستا و امری کرد که او بهیندریته کن اوی . و که نیزیکی وی بو
٤١ لي پرسی * چت دوی که بو تو بکم ? بلّا او کتی : یا رب : که
٤٢ ببینم * و یسوع به وی گت : ببینه ! ایمانی تو اتوی خلاص کردوه *
٤٣ و جی بجی دیتی و وەدوای وی کوت و شکری خلّای د کرد . و همو
قوم وختیکي اویان دی حمدی خلّایان د کرد *

## باب ۱۹

۱:۲ و هاته ژوری و به نیو یریحو دا رادبرد * و اوتا پیاویك هبو :
۳ نیوی زکّـی . و اوه مزنی راداران بو و او دولمند بو * و دیویست که
یسوعی ببینی که کیهه یه : و نیدتوانی لبر غلبای چونکه به بژن چکوله
٤ بو * و بو پیشوه لنگی دا و وەسر دارەتویکی کوت هتا کو اوی ببینی
٥ چونکه دبا باو ریی دا رابری * و که یسوع هاته او جي : تماشای
سروی کرد و به وی گت : ای زکّـی : زو به و وره خواری چونکه
٦ بو من لازمه که اورو ده مالی تودا بمینم * و به زوی هاته خواری
٧ و اوی به خوشحالی قبول کرد * و که دیتیان همو بولەبولیان د کرد
دیان گت : که لکن پیاویکی گناحکار وەژور کوت که منزل بگری*
٨ بلّا زکّی راوستا و به ربّی گت : اوتا ای رب : نیوی مالی خوم به
فقیران ددم : و اگر به ظلم چتیکم له کسیکی استاند بی : چوار
٩ هینده ددموه * و یسوع به وی گت : اورو خلاصی بو او مالی بوه :

۱۰ چونکه اویش کوری ابراهیمه * چونکه کوری انسانی هاتوه که بو
ون بوی حول بدا و خلاص بکا *
۱۱ و که اوان له او چتانی گوییان دگرت مثلیکی زیادی گت :
چونکه او نیزیکی اورشلیمی بو و اوان فکریان دکرد که پادشایتی
۱۲ خلّای دبی جی بجی اشکرا ببی * دنا کتی : پیاویکی اصلزاده بو
۱۳ ولاتیکی دور چو که پادشایتیکی بو خوی ورگری و بگَریتوه * و
ده عبدانی خوی بانگ کرد و ده منی به وان دا و به وانی گت :
۱٤ سودی بکن هتا دیموه * بلّا رعیتانی وی اویان دبغضاند و قاصدیان له
دوای وی نارد دیان گت : نامانوی که اوه لسر امه پادشایتی بکا *
۱٥ و بو که وختیکی پادشایتی ورگرتبوه گَراوه و کتی که او عبدانی
که دراوکی به وان دابو بو کن اوی بانگ بکرین هتاکو بزانی
۱٦ هر یك چند قازانجی کرد بو * بلّا ای هول هاته پیشی دیگت : ای
۱۷ اغا منی تو ده منی قازانج کردوه * و به وی گت : آفرین ای عبدی
چاك : چونکه ده چتیکی زور کم دا امین بوی : حکماتت لسر ده
۱۸ شاران دبی * و ای دویم هات دیگت : ای اغا : منی تو پینج منی هینا*
۱۹ : ۲۰ به ویشی گت : اتوش لسر پینج شاران دبي * و یکی دیکه هات
دیگت : ای اغا : اوتا منی خوت که ده دسمالیکی داندراو رامگرتوه*
۲۱ چونکه له تو ترسام لبر اوی که پیاویکی تُندی . او چتی که داتناوه
۲۲ هلدگری : و او چتی که نتچاندوه دیچنی * به وی گت : له زاری
خوت حکم لسرت دکم ای عبدی خراپ . اری دتزانی که امن

پیاویکی تُندم : که او چتی که دامنَناوه هلدگرم : و او چتی که
۲۳ نمچاندوه دیچنم * دنا لبر چی دراوی من به صرافت نداوه ؟ و امن
۲٤ وختیکی هاتم اوم دگل سوتی طلب کردبایه * و به اوانی که لکنی
راوستا بون کتی : منی لی بستینن و بدن به وی که ده منی هیه *
۲٦:۲٥ و به وییان گت : ای اغا ده منی هیه * به انگو دلّیم : هر کس که
هیتی به وی ددری : بلّا اوی که نیتی اوی که هشیتی لی دستیندری*
۲۷ بلّا او دژمنانی من : اوانی که نیان‌دویست که امن لسر اوان پادشایتی
بکم بیننه ایره و له بر چاوی من اوان بکوژن *
۲۸ و که اوانی کتبو لپیشوه دروی و بو اورشلیمی وه‌سر دکوت *
۲۹ و بو که وختیکی نیزیکی بیت‌فاگی و بیت‌عنیا بو لکن او کیوی
۳۰ که کیوی زیتونی بانگ دکری : دوانی له شاگردانی نارد * دیگت:
برونه او دیی که لپیش تانه . ده ویدا که چونه ژوری : جاشکیکی
بستراو پیدا دکن که هیشتا هیچکس لسر اوی رونیشتوه . اوی
۳۱ بکنَوه و بیهینن * و اگر کسیك له انگو بپرسی لبر چی دیکنَوه :
۳۲ وها بلّین : چونکه رب محتاجی وی یه * و ناردراوان روین و چلونیکی
۳۳ به وانی کتبو پیدایان کرد * و که اوان جاشککه‌یان دکردوه صاحبانی
۳٤ وی به وانیان گت : بو چی او جاشکی دکنوه ؟ * بلّا اوان کتیان :
۳٥ چونکه رب محتاجی وی یه * و اویان هینا کن یسوع و جلّی خویان
۳٦ هاویشته سر جاشککی و یسوع‌یان سوار کرد * و که او دچو : جلّی
۳۷ خویان ده رییدا رادخست * بلّا وختیکی الان نیزیکی بره‌ژیری کیوی

زيتونی بو : همو جماعتی شاگردان به خوشحالی دستیان پی کرد که
به دنگیکی بلند شکری خلّای بکن بو همو او قوتانی که دیبویان *
٣٨ دیان گت : ممبارك بی او پادشای که به نیوی رب دی . ده آسماندا
٣٩ سلام و ده بلنداندا جلال * و هیندیك له فریسیان لو غلبایی به وییان
٤٠ گت : ای ماموستا : شاگردانی خوت زم بکه * و جوابی دا و کتی :
به انگو دلّیم : اگر اوانه بی دنگ بن بردان دقیژینن *
٤١:٤٢ و که نیزیك بو و شاری دی : لسر اوی گریا * و کتی : اگر
بزانیبای اتوش هیشتا داو روژیدا او چتانی سلامتی خوت : بلّا اویستا
٤٣ له بر چاوانی تو شاردراون * چونکه روژان لسر اتو دین که دژمنانی
تو له دوری تو سنگریکی هلدکنن و دورندوری تو دگرن و له همو
٤٤ لاییکی اذیتت ددن * و اتو دگل خاکی ریك دخن و مندالانت ده
تودا و برد لسر برد ده تودا نایلن : لبر اوی که زمانی توش بونی
٤٥ خوتت نزانیوه * و که وەژور هیکلی کوت : دستی پی کرد که اوانی
٤٦ در بکا که دیانفروت * به وانی گت : نوسراوه که مالی من دبی
مالی نویژ ببی : بلّا انگو اوو کردوته اشکوتی جردان *
٤٧ و همو روژ ده هیکلیدا تعلیمی ددا : بلّا کاهنانی گوره و
٤٨ خویندواران و محترانی قومی حولیان ددا که اوی هلاك بکن * و
پیدایان ندکرد که چی بکن : چونکه جمعی قومی لسر اوی هلاوسرا
بون که گوی لی بگرن *

## باب ۲۰

۱ و ده یکیك لو روژاندا بو که وختیکی او ده هیکلیدا خلکی تعلیم
ددا و انجیلی وعظ دکرد : کاهنانی گوره و خویندواران دگل پیران
۲ هاتنه سری * و اویان دواند دیان گت : به مه بلّی : به چی حکماتیکی
۳ اوانه دکي یان کییه که او حکماتی به تو داوه ؟ * بلّا جوابی دا و به
وانی گت : امنیش قصیــکی لهٰ انــگو دپرسم و به من بلّین *
۴:۵ اری تعمیدی یوحنّا له آسمانی بو یان له انسانی * بلّا اوان ده خویاندا
مصلحتیان کرد دیان گت : اگر بلّیین له آسمانی : دلّی : لبر چی به
۶ وی باورو نکرد ؟ * و اگر بلّیین: له انسانی:همو خلکی امه بردهباران
۷ دکن چونکه خاطرجمن که یوحنّا پیغمبر بو * و جوابیان دا : نازانین
۸ له کوی بو * و یسوع به وانی گت : امنیش به انگو نالّیم به چی
حکماتیکی اوانه دکم *
۹ بلّا دستی پی کرد که او مثلی به خلکی بلّی : پیاوك رزیکی
۱۰ چقاند و اوی به رزوانان اسپارد و هتا مدیکی زور سفری کرد * و ده
وختی خویدا خذمتکاریکی نارده کن رزوانان هتاکو له حاصلی رز
۱۱ به وی بدن : بلّا رزوانان اویان کتا و به بطالی نردیانوه * و دیسان
خذمتکاریکی دیکی نارد : بلّا اوان اویشیان کتا و بی حرمتیان کرد
۱۲ و به بطالی ناردیانوه * و دیسان ای سیمی نارد : بلّا اوان اویشیان
۱۳ بریندار کرد و وهدریان خست * بلّا صاحبی رز کتی : چی بکم ؟

١٤ کوری خوشوستی خوم دنیرم . بشکم له وی شرمی بکن * بلّا وختیکی
او رزوانانه اویان دی دنیو خویاندا مصلحتیان کرد دیان گت : اوه
١٥ میراتگره : با بیکوژین هتاکو متراتکه ایمه ببی * و اویان له رزی
١٦ خسته دری و کشتیان . دنا صاحبی رز د گل اوان چی دکا ؟ * دی
و او رزوانانه هلاك دکا و رز به ایدیکان ددا . بلّا وختیکی بیستیان
١٧ کتیان : حاشا * بلّا او تماشای وانی کرد و کتی : دنا اوه که نوسراوه
چیه : او بردی که بَنّایان فریبان دا : او بو به سری قُلنچکی *
١٨ هر کس که لسر او بردی بکوی دشکندری بلّا لسر کی که او
١٩ بکوی اوی ورد و خاش دکا * و خویندواران و کاهنانی گوره داو
سعاتیدا طمایان بو که دستان لسر اوی باویژن : و له خلکی ترسان :
چونکه تی گیشتن که او مثلی درحقی وان گت *

٢٠ و که له وی سیاد بون جاسوسان که خویان به درو صادق دکرد
ناردیان که قصی وی بگرن هتاکو اوی به قوت و به حکماتی حاکم
٢١ تسلیم بکن * و لییان پرسی دیان گت : ای ماموستا : دزانین که راست
قصان دکی و تعلیم ددی و خاطر ناگري بلّا به راستی ریی خلّای
٢٢ فیر دکی * اری بو مه درسته که سرانی به قیصری بدین یان نه *
٢٣ : ٢٤ بلّا ده حیلیی وانی گیشت و به وانی گت * دیناریك به من نیشان
بدن : اری شکل و خطی کیی هیه ؟ و اوان کتیان : ای قیصری *
٢٥ و او به وانی گت : دنا چتی ای قیصری به قیصری بدن و چتی
٢٦ ای خلّای به خلّای * و نیان‌دتوانی قصی وی لکن خلکی بگرن .

٢٧ و له جوابی وی عجایب مان و بی دنگ بون * بلّا هیندیك له
صدوقیان که حاشا دکن که قیامت هیه : هاتنه پیشی و لییان پرسی *
٢٨ دیان گت : ای ماموستا : موسی بو مـَی نوسیوه : اگر کسیك برای
بمری که ژنی هبی و او بی اولاد بی : که برای وی دبی او ژنی
٢٩ بینی و توی برای خوی هلبستینی * دنا حوت برا هبون و ای هول
٣٠:٣١ ژنیکی هینا و به بی اولادی مرد * و ای دویم * و ای سیم اوی
٣٢ هینا . و هر واش او حوتانه مردن و اولادیان بجی نهیشت * و ده
٣٣ آخریدا ژنکش مرد * دنا او ژنه ده قیامتیدا ژنی کیهه له وان دبی ؟
٣٤ چونکه هر حوتان اویان ژن ببو * و یسوع به وانی گت : اهلی او
٣٥ دنیایی ماره دکن و ماره دکرین * بلّا اوانی که لایق حساب کراون
که او دنیایی دیکه و قیامتی له نیو مردوان ورگرن : نه ماره دکن
٣٦ و نه ماره دکرین * چونکه ایدی ناتوانن بمرن چونکه و کو ملایکتانن
٣٧ و مندالانی خلّان چونکه مندالانی قیامتن * امّـا کـه مردوان
هلستیندرینوه موساش نیشانی داوه لکن دروی وختیکی به رب دلّی :
٣٨ خلّای ابراهیم و خلّای اسحاق و خلّای یعقوب * امّا او خلّا ای مردوان
٣٩ نیه بلّا ای زندوان . چونکه همو بو وی دژین * هیندیك له خویندواران
٤٠ جوابیان دا و کتیان : ای ماموستا : چاکت گت : * چونکه ایدی
نیاندویرا چتیکی پرسیاری لي بکن *
٤١ و او به وانی گت : چلون دلّین که مسیح کوری داودیه ؟ *
٤٢ چونکه داود بو خوی ده کتیبی زبوردا دلّی : رب به ربّی من کتی :

٤٣ له لای راستی من رونیشه * هتا دژمنانی تو بو پی راخـَری پیانی تو
٤٤ دابنیم * دنا داود اوی به رب بانگ دکا و چلون کوری وی یه ؟ *
٤٥ : ٤٦ و که همو خلکی دیان‌بیست : به شاگردانی گت * هوشیار بن له
خویندواران که کیفیان لی یه که به جلّی دریژ بگـَرن : و پیان خوشه
سلاون ده میدانانداو کرسیانی بره‌ژور ده کنشتاندا و جیانی ژورو
٤٧ ده میمانیاندا*اوانی که مالانی بیوه‌ژنان قوت ددن و به ریاي نویژانی
دریژ دکن . اوانه دیوانی گرانتر ورد گرن *

## باب ٢١

١ و که تماشای سروی کرد دولمندانی دی که دیاریی خویان ده
٢ خزینی داویشت * بلّا بیوه‌ژنیکی فقیری دی که دو فلوسی ده وی
٣ هاویشت * و کتی : به راستی به انگو دلّیم : که او بیوه‌ژنه فقیره
٤ له هموان پتری تی هاویشت * چونکه همو اوانه له زیدي خویان دنیو
دیاریاندا هاویشت : بلّا اوه له فقیری خوی همو بریچونی که هیبو
تي هاویشت *
٥ و که هیندیك بحثی هیکلی دیان گت که به بردانی چاك و دیاریان
٦ رازاندراو بو کتی * او چتانی که دبینن : روژان دین که ده واندا
٧ برد لسر برد نامینی که نروخینـدری * بلّا پرسیـاریان لی کرد
دیان گت : ای ماموستا : دنا کنگی اوانه دبن؟ و نیشانی چیه وختیکی
٨ اوانه دبن ؟ * و او کتی : هوشیار بن که هلنخلتیندرین : چونکه زوران

به نیوی من دین و دڵین : امنم و وخت نیزیك بوه . له دوای وان
۹ مچن * امّا وختیکی بحثی شران و شلوقیان دبین مشیوین چونکه لازمه
که اوانه هولی ببن بلّا آخری زو نبی *
۱۰ او دمی به وانی گت : ملّت لسر ملّت راست دبیتوه و پادشایتی
۱۱ لسر پادشایتی * و زلزلانی گوره و قاطیان و وبایان ده جی جیاندا
دبن . و دیتوانی صاحب ترس و نیشانانی گوره له آسمانی پیدا دبن*
۱۲ بلّا له پیش همو او چتانه دستانی خویان لسر انگو داویژن و اذیتو
ددن و به کنشتان و بندیخانان تسلیمو دکن و لپیش پادشایان و
۱۳ حاکمان دبردرین لبر خاطرِ نیوی من * شایدی بو انگو دبی *
۱٤ دنا ده دڵی خوتان دابنین که ده پیشدا بو جواب دانی فکر نکن *
۱٥ چونکه امن زار و عقلی به انگو ددم که همو مدعیانی انگو ناتوانن
۱٦ ضد راوستن یان قصان بکن * بلّا انگو له والدینیش و برایان و خزمان
۱۷ و دوستان تسلیم دکرین و له انگو دکوژن * و انگو له همـوان
۱۸ دبغضیندرین لبر نیوی من * و مویك له سری انگو ون نـابی *
۱۹ به صبری خوتان گیـّانی خوتان قازانج بکن *
۲۰ بلّا وختیکی دبینن که اورشلیم به لشکران دورندور بدری:او دمی
۲۱ بزانن که خراپی وی نیزیك بوه * او دمی اوانی که ده یهودیی دان
با بو کیوان هلین : و اوانی که دنیو وی دان با وەدر بکون : و اوانی
۲۲ که ده دییان دان با وەژور اوی نکون * چونکه اوانه روژانی طولـَن
۲۳ هتاکو همو چتانی که نوسراون تواو ببن * وای بو آوسان و شیردران

داو روژاندا چونکه تنگانیکی گوره لسر ارضی دبی و غضب لسر
۲٤ او قومی * و به دمی شیری دکون و لنیو همو طایفان یخسیر دبردرین
و اورشلیم له طایفان پامال دکری هتا وختانی طایفان تواو بین *
۲۵ و ده روژ و مانگ و استیراندا نیشانان دبن و لسر ارضی شیواوي
۲٦ طایفان به بی هومیدی : له دنگی بحری و شپولان * و دلی خلکی له
ترس و چاوەنوری او چتانی که لسر اوادانی دین له خو دبنوه :
۲۷ چونکه قوتانی آسمانان دلرزن * و او وختی کوری انسانی دبینن
۲۸ ده هوریکیدا به قوت و جلالی گوره دی * بلا وختیکی او چتانی
دست پی دکن که بین : خوتان راست بکنوه و سری خوتان بلند
بکن لبر اوی که خلاصی انگو نیزیکه *
۲۹ و مثلیکی به وان گت : له دارەهنجیری و له همو داران تماشا
۳۰ بکن * وختیکی اویستا گلای در دکن : دبینن و بو خوتان دزانن که
۳۱ الان هاوین نیزیکه * هر واش انگو : وختیکی دبینن که او چتانه
۳۲ دبن : بزانن که پادشایتی خلای نیزیکه * راستی به انگو دلیم که او
۳۳ سلسله قط رانابری هتا او چتانه همو دبن * ارض و آسمان رادبرن
بلا کلامی من قط رانابرن *
۳٤ بلا له خوتان اگادار بن نبا دلانی انگو به زورخوری و مستی
و خمی بریچونی گران بین و او روژی لنکاو لسر انگو بی وکو
۳۵ داویکی * چونکه لسر همو رونیشتوان لسر روی همو ارضی دی *
۳٦ بلا به خبر بن ده هر وختدا و دعا بکن هتا کو بتوانن له همو او چتانی

که دین خلاص بین و له حضوری کوری انسانی راوستن *
٣٧ و به روژان ده هیکلیدا تعلیمی ددا بلّا به شوان وه‌در د کوت و ده
٣٨ کیوی که کیوی زیتونی بانگ د کری رایدبوارد * و صبحینی زو
همو قومی هاتنه کن اوی ده هیکلیدا که گوی لی بگرن *

باب ٢٢

٢:١ و جیژنی فطیری که فصح بانگ د کری نیزیك بو * و کاهنانی
گوره و خویندواران حولیان ددا چلون اوی بکوژن : چونکه له قومی
دترسان *
٣ بلّا شیطان وه‌ژور یهودای کوت که اسخروطی بانگ د کرا و که
٤ له حسابی او دوازدانه بو * و چو و د گل کاهنانی گوره و سرداران
٥ قصی کرد چلون اوی به وان تسلیم بکا * و خوشحال بون و ریك
٦ کوتن که دراو به وی بدن * و راضی بو و حولی فرصتی ددا که اوی
به دزی له خلکی به وان تسلیم بکا *
٧ و روژی فطیری هات که ده ویدا لازم بو کـه برخی فصحی
٨ بکوژریتـوه * و پطروس و یوحنّای نارد دیگت : برون و فصحی بو
٩ مه حاضر بکن که بیخوین * و اوان به وییان گت : لکوی دتوی
١٠ که حاضر بکین ؟ * و او به وانی گت : اوتا وختیکی انگو وه‌ژور
شاری د کون : پیاویك توشو دبی که جریك آو هلد گری . وه‌دوای
١١ وی بکون وه‌ژور او مالی که او وه‌ژور د کوی * و به صاحبی او مالی
بلّین : ماموستا به تو دلّي : لکوی یه او منزلی که لوی د گل شا گردانی

۱۲ خوم فصحی بخوم * و او به انگو نیشان ددا بالاخانیکی گوره و فرش
۱۳ کراو : لوی حاضر بکن * و روین و پیدایان کرد هر وکو او به
وانی کتبو : و فصحیان حاضر کرد *
۱٤ و که سعات هات لسر سفری رونیشت و رسولان دگل اوی *
۱٥ و به وانی گت : زور حسرتم کیشاوه که او فصحی دگل انگو بخوم
۱٦ له پیش اوی که اذیت دکیشم * چونکه به انگو دڵیم که ایدی قط
۱۷ اوی ناخوم هتا ده پادشایتی خڵایدا تواو دبی * و پیالی هلگرت :
۱۸ شکری کرد و کتی : اوی ورگرن و لنیو خوتان بشی بکن * چونکه
به انگو دڵیم : له وی پاش قط ناخوموه له حاصلی میوی هتا پادشایتی
۱۹ خڵای دی * و نانی هلگرت : شکری کرد : لتی کرد و دای به
وان دیگت : اوه بدنی منه که بو انگو ددری . اوی بکن بو یادگاری
۲۰ من * و هر واش له پاش خواردنی شام پیالی هلگرت دیگت : او
پیاله عهدی تازه یه ده خوینی مندا که بو انگو درژیندری *
۲۲:۲۱ بڵا اوتا دستی تسلیمکری من دگل امن لسر سفره یه * چونکه
هلبته کوری انسانی دروا چلونیکی تاعین کراوه : بڵا وای بو او
۲۳ کسی که به سببی وی تسلیم دکری * و اوان دستیان پی کرد که
لنیو خویان پرسیار بکن کیهه له وان دبا او چتی بکا *
۲٤ و مباحثه‌یکیش لنیو اوان بو که کیهه له وان گوره‌تر حساب بکری *
۲٥ بڵا او به وانی گت : پادشایانی ملّتان حکماتی لسر اوان دکن و
۲٦ اوانی که دستلاتیان لسر اوان هیه چاکه‌کران بانگ دکرین * امّا

انگو وا نبن : بلّا اوی گوره‌تر لنیو انگو با و کو چکوله‌تر ببی : و
٢٧ اوی هول و کو اوی که خذمت د کا * چونکه کیهه گوره‌تره اوی که
لسر سفری رودنیشی یان اوی که خذمت د کا ؟ مگر اوی نیه که
لسر سفری رودنیشی ؟ بلّا امن لنیو انگوم و کو اوی که خذمت د کا *
٢٨ بلّا انگو اوانن که د گل امن ده تجربانی مندا چاك راوستاون *
٢٩ و امن بو انگو پادشایتیکی وعده د کم چلونیکی بابم بو من وعدی
٣٠ کردوه * هتا کو ده پادشایتی مندا له سفری من بخون و بخونوه :
و لسر تختان روبنیشن و لسر او دوازده سبطی اسرائیل حکمی بکن *
٣١ ای شمعون شمعون : اوتا شیطان انگوی طلب کردوه که و کو
٣٢ گنم بیژینگو بکا * بلّا امن بو تو دعام کردوه که ایمانی تو کم نبی:
٣٣ و اتو وختیکی ورد گَریی برایانی خوت قایم بکه * و او به وی گت :
یا رب حاضرم که د گل اتو ده بندیخانی و ده مردنیشدا بچم *
٣٤ بلّا او کتی : به تو دلّیم : ای پطروس : اورو کلباب ناخوینی هتا
سَی جار حاشا د کی که امن د ناسی *
٣٥ و به وانی گت : وختیکی انگوم نارد به بی کیسه و توربین و
کوش : اری بو چتیکی کمیتیو کیشا ؟ بلّا اوان کتیان : بو هیچ
٣٦ چتیك * به وانی گت : بلّا اویستا اوی که کیسَی هیه با هلی گری :
هر وا تورینیش . و اوی که نیَتی با جلّی خوی بفروشی و شیریکی
٣٧ بکری * چونکه به انگو دلّیم که او چتی که نوسراوه لازمه که ده
مندا تواو ببی یعنی اوه : و د گل بی شرعیان حساب کرا . چونکه

۳۸ هر چتی بحثی منیش آخری هیه * و اوان کتیان : یا رب : اوتا دو
شیر لیره هن . و او به وانی گت : بسه *
۳۹ و وه‌در کوت و وکو عادتی بو بو کیوی زیتونی چو و شا گردانیش
٤۰ وه‌دوای وی کوتن * و که گیشته او جیی : به وانی گت : دعا بکن
٤۱ که ده تجربی نکون * و او به قد بردهاویشتنیکی له وان کیشرا و به
٤۲ سر چوکان دا هات و دعای کرد * دیگت : یا بابه : اگر بتوی :
٤۳ او پیالی له من هلگره : امّا نه ارادی من بلّا ایتو بی * و ملایکتیك
٤٤ له آسمانی بو وی اشکرا بو که اوی به قوت د کرد * و که ده زور
تنگانیدا بو به سعیتر دعای د کرد و عرقی وی وکو دلوپانی خوین
٤٥ بو که لسر ارضی د کوتن * و که له دعا هلستا : هاته کن شاگردان
٤٦ و اوانی له خمناکی نوستو پیدا کرد * و به وانی گت : بو چی دنون ؟
هلستن و دعا بکن که ده تجربی نکون *
٤۷ که هیشتا او قصی د کرد اوتا غلبایك : و اوی که یهودا بانگ د کرا
یکیك لو دوازدانه لپیش اوان دچو و نیزیکی یسوعی هات که اوی
٤۸ ماچ بکا * بلّا یسوع به وی گت : ای یهودا : اری کوری انسانی
٤۹ به ماچیکی تسلیم د کی ؟ * و اوانی که دوری وی بون : وختیکی
دیتیان او چتی که دبا ببی کتیان : یا رب : اری به شیر لی بدین ؟ *
۵۰ و یکیك له وان له خذمتکاری کاهنی گوری دا و گوی راستی وی
۵۱ بری * بلّا یسوع جوابی دا و کتی : لی گرین هتا اوی . و دستی له
گوی دا و اوی صاغ کردوه *

۵۲ و یسوع به کاهنانی گوره و سردارانی هیکلی و پیران که لسر
ئوی هاتبون کتی : وکو بو سر جردیکی وەدر کوتون به شیران و
۵۳ کتکان * وختیکی هر روژ د گل انگو ده هیکلیدا بوم دستو لسر امن
دریژ نکرد بلّا اوه سعاتی انگو یه و حکماتی تاریکای *

۵٤ و که اویان گرتبو : بردیان و هینایانه ژور مالی کاهنی گوره :
۵۵ و پطروس له دوروه وەدوای د کوت * و که آوریکیان ده نیوەراستی
حصاریدا هلکردبو و پیکوه رونیشتبون پطروس لنیو اوانی رونیشت *
۵٦ و قرەواشیك اوی لکن روناکای رونیشتو دی و چاوی له وی درو
۵۷ و کتی : اوش د گل اوی بو * بلّا حاشای کرد دیگت : ای ژن :
۵۸ اوی ناناسم * و له پاش کمیك یکی دیکه اوی دی و کتی : اتوش
۵۹ له وانی . بلّا پطروس کتی : ای پیاو نیم * و که به قد سعاتیکی
رابردبو یکیکی دیکه قایمی کرد دیگت : به راستی اوش د گل اوی
٦۰ بو چونکه جلیلیشه * بلّا پطروس کتی : ای پیاو نازانم چی دلّي . و
٦۱ هر داو سعاتیدا که هیشتا او قصی د کرد کلباب خویندی * و رب
ورگـَرا و له پطروس تماشای کرد و پطروس او قصی ربّی وەبیر
هاتـَوه چلونیکی به وی کتبو له پیش اوی که کلباب اورو بخوینی :
٦۲ سـَی جار له من حاشا د کی * و وەدر کوته دری و به تالی گریا *
و او پیاوانی که اویان رادگرت گپیان پی ددا و قامچییان لی ددا *
٦٤ و که روی وییان داپوشی لییان دپرسی و دیان گت : پیغمبریتی بکه

٦٥ او کییه که له توی دا ؟ * و زور چتانی دیکه به کفریتی ضدی ویان
قصه دکرد *
٦٦ و که روژ بو : پیرانی قومی و کاهنانی گوره و خویندواران خر
٦٧ بونـَوه و اویان برده مجلیسی خویان * دیان گت : اگر اتوی مسیح
به مه بلّی . به وانی گت : اگر به انگو بلّیم : قط باور ناکن *
٦٨:٦٩ و اگر بپرسم قط جواب نادن * بلّا له وی پاش کوری انسانی له
٧٠ لای راستی قوتی خلّای رودنیشی * و همو کتیان : دنا اتو کوری
٧١ خلّای ؟ و به وانی گت : انگو دلّین که امنم * بلّا اوان کتیان :
ایدی چی احتیاجیمان به شایدی هیه ؟ چونکه بو خومان له زاری ویمان
بیستوه *

باب ٢٣

٢:١ و همو جماعتی وان هلستان و اوین برده کن پیلاطوس * و دستیان
پی کرد که گلیی لی بکن دیان گت : اومان پیدا کردوه که ملّتی
مه هلدخلتینی و قدغه دکا که خرج به قیصری ندن : و دلّی که
٣ او بو خوی مسیح و پادشا یه * بلّا پیلاطوس لي پرسی دیگت : اری
اتو پادشای یهودیانی ؟ او جوابی به وی دا و کتی : اتو دلّي *
٤ و پیلاطوس به کاهنانی گوره و خلکی گت : داو پیاویدا هیچ سوچیك
٥ پیدا ناکم * بلّا اوان زوریان لی دکرد دیان گت : قومی دشیوینی
به وی که ده همو یهودستاندا تعلیمی ددا و له جلیلی راگرتویه هتا ایره *
٦ و که پیلاطوس اوی بیست پرسیاری کرد اگر او پیاوه جلیلی

۷ یه * و که زانی که له حکماتی هیرودیسه : اوی نارده کن هیرودیس
۸ که بو خوش داو روژاندا ده اورشلیمیدا بو * بڵا هیرودیس وختیکی
یسوعی دی زور خوشحال بو چونکه له میژه حظی دکرد که اوی ببینی:
لبر اوی که بحثی وی بیستبو و به هومید دبو که کردنی نیشانیکی
۹ له وی ببینی * و به زور قصان پرسیاری لي دکرد : بڵا او هیچ جوابی
۱۰ به وی ندا * و کاهنانی گوره و خویندواران راوستابون و به تُندی
۱۱ گلییان له وی دکرد * بڵا هیرودیس دگل عسکرانی خوی اوی
بی حرمت کرد و گپی پی دا و جلّیکی بریقَدار له سری هاویشت و
۱۲ ناردیوه کن پیلاطوس * و داو روژیدا هیرودیس و پیلاطوس دگل
یکتری دوست بونوه چونکه له پیش اوی دگل یکتری ده دژمنیتیدا
بون *
۱۳ بڵا پیلاطوس کاهنانی گوره و مزنان و قومی بانگ کرد *
۱٤ و به وانی گت : او پیاوه‌تان هیناوه کن امن وکو یکیکی که قومی
هلدخلتینی و اوتا امن له بر چاوی انگو سوراغم کردوه و داو پیاویدا
۱۵ هیچ سوچیکم پیدا ناکردوه وکو انگو گلیی لي دکن * و نه
هیرودیسیش . چونکه اوی بو کن امه ناردوه و اوتا هیچ چتیك
۱٦ لایقی کشتنی به وی ناکراوه * دنا اوی تمبی دکم و برلای دکم *
۱۷ :۱۸ بڵا ده جیژنیدا واجب بو که یکیك بو وان برلا بکا * بڵا هممویان
پیکوه قیژاندیان دیان گت : اوه هلگره و براباسی بو مه برلا بکه *
۱۹ اوی که لبر شلوقییکی که ده شاریدا بو و لبر قتل ده بندیخانی هاویشرا

۲۰ بو * بڵا دیسان پیلاطوس دگل اوان قصی کرد : چونکه دیویست که
۲۱ یسوعی برلا بکا * امّا اوان قیژاندیان و دیان گت : اوی له سیداری
۲۲ بده : له سیداري بده ! * بڵا جاری سیم به وانی گت : بو چی ؟ اوه
چی خراپیکی کردوه ؟ هیچ سببی کشتنی ده ویدا پیدام نکردوه .
۲۳ دنا اوی تمبی دکم و برلا دکم * امّا اوان به دنگانی بلند زورییان
لی دکرد و طلبیان دکرد که او له سیداری بدری : و دنگانی وان
۲٤ غالب بون * و پیلاطوس حکمی کرد که وکو طلبی وان ببی *
۲٥ و اوی برلا کرد که لبر شلوقی و قتل ده بندیخانیدا هاویشترا بو و
که طلبیان کرد : بڵا یسوعی به ارادی وان تسلیم کرد *
۲٦ و که اویان دبرد یکیك شمعونی کورینی که له زویی دهات گرتیان
۲۷ و سیداری لسر اویان دانا که له دوای یسوع هلگری * و جمعیکی
زوری خلکی وەدوای وی دکوتن و له ژنان که شینَییان دکرد و له
۲۸ سر اوی دگریان * بڵا یسوع بو وان ورگَرا و کتی : ای کچانی
اورشلیمی : له سر امن مگرین امّا له سر خوتان و له سر مندالانی
۲۹ خوتان بگرین * چونکه اوتا روژان دین که ده واندا دڵین : خوزگه
۳۰ به نزوکان و زگان که نزاون و ممکان که شیریان نداوه * او دمی
دست پی دکن که به کیوان بڵین : لسر امه بکون : و به تپولکان :
۳۱ امَی داپوشن * چونکه اگر او چتانی به داری تر دکن : به وشکی
۳۲ چی دبی ؟ * و دو خراپکارانی دیکش دگل اوی بردران که
۳۳ بکوژرین * و که هاتنه او جي که کاسی سر بانگ دکری لوی

اویان له سیداری دا و او خراپکارانش یکیك له لای راستی و یکیك
۳٤ له لای چپی * و یسوع کتی : یا بابه : اوانه ببخشه چونکه نازانن چی
دکن . و که جلّی ویبان بش دکرد پشکانیـان لی هـاویشت *
۳۵ و خلکی راوستابون و تماشایان دکرد . بلّا مزنانیش مسخره‌یان دکرد
دیان گت : ایدیکانی خلاص کردوه : با خوی خلاص بکا اگر او
۳٦ مسیحی خلّای : او هلبژیراوه ببی * و عسکرانیش گپیان پی ددا
۳۷ به وی که دهاتنه پیشی و سرکه‌یان به وی ددا * و دیـان گت :
۳۸ اگر اتو پادشای یهودیانی : خوت خلاص بکه * و سرنامیکیش له
۳۹ بره‌ژوری وی هبو : اویه پادشای یهودیان * و یکیك لو خراپکارانی
که هل‌اوسرا بون کفری پی دکرد : اری اتو مسیح نی ؟ خوت
٤۰ و امه خلاص بکه * بلّا اوی دیکه جوابی دا : زمّی لي کرد و کتی:
٤۱ اری اتو له خلّاش ناترسي که هر داو عاذابی دای ؟ * و امه بی
شك به حق : چونکه وکو عملانی خومان حقی ورد گرین : بلّا اوه
٤۲ هیچ چتیکی بی قایدی نکردوه * و کتی : یا یسوع : امن وه‌بیرت بینه
٤۳ وختیکی ده پادشایتی خوتدا ییی * و او به وی گت : راستی به تو دلّیم:
اورو دگل امن ده فردوسدا دبی *
٤٤ و الان نیزیکی سعاتی ششم بو و تاریکای لسر همو ارضی بو هتا سعاتی
٤۵ نویم * چونکه روژ تاریك بو . و پـَردی هیکلی ده نیوه‌راستیدا لت بو*
٤٦ و یسوع به دنگیکی بلند قیژاندی و کتی : یا بابه : روحی خوم به دستی
٤۷ تو دسپیرم . و که اوی گت روحی تسلیم کرد * و که یوزباشی دیتی

او چتی که بو : شکری خلاّی کرد دیگت : به راستی او پیاوه صادق
۴۸ بو * و همو خلکی که بو او تماشایی خر بونوه : وختیکی دیتیان او
۴۹ چتانی که بون : له سینگانیان دا و گَرانوه * بلاّ همو آشنایانی وی
و ژنان که د گل اوی له جلیلی هاتبون له دوروه راوستابون و تماشای
او چتانه‌یان د کرد *
۵۰ و اوتا پیاویك نیوی یوسف که مشیر بو : پیاویکی چاك و عاقل *
۵۱ او به تگبیر و عملی وان راضی ندبو : له اریماتیـّه : شاریکی یهودیان :
۵۲ و که چاوه‌نوری پادشایتی خلاّی بو * اوه چو کن پیلاطوس و میتی
۵۳ یسوعی طلب کرد * و هینایه خواری و اوی به کتانی پیچاوه و ده
۵۴ قبریکی هلقندراوی نا که ده ویدا قط هیچکس داندّرا بو * و روژی
۵۵ تدارك بو و شمو نیزیك دبو * و او ژنانی که د گل اوی له جلیلی
هاتبون : وه‌دوای کوتن و قبر که‌یان دی و چلون میتی وی داندرا *
۵۶ و که گَرانوه : عطران و رونانی خوشبونیان حاضر کرد : و ده
شمویدا موافقی حکم رحت بون *

## باب ۲۴

۱ بلاّ ده روژی هولی حوتویدا : صبحینی زو هاتنه سر قبری و او
۲ عطرانی که حاضریان کردبو دیان‌هینا * و برد کی له سر قبری خلور
۳ کراو پیدایان کرد * بلاّ وختیکی وه‌ژور کوتن میتی رب یسوع‌یان
۴ پیدا نکرد * و بو که وختیکی اوان له سر او چتی عجایب دمان :

٥ اوتا دو کس ده جلّی بریقـدار دا لکن اوان راوستابون * و که اوان
ترسه‌نوك بون و روی خویان بو ارضی بر دابووه : به وانیان گت :
٦ بو چی بو زندوی لنیو مردوان حول ددن ؟ * لیره نیه بلّا هلستاوتوه .
وه‌بیرو بینن چلون د گل انگو قصی کرد وختیکی هیشتا ده جلیلیدا
٧ بو * دیگت : بو کوری انسانی لازمه که به دستانی انسانانی گناحکار
٨ تسلیم بکری و له سیداری بدری و ده روژی سیمدا هلبستیتوه * و
٩ قصانی وییان وه‌بیر هاتـوه * و له سر قبری گـَرانوه و همو او چتانی
١٠ باو یازدانه و به همو ایدیکانیان خبر دا * بلّا مریم مجدلی و یونّا و
مریم دایکی یعقوب بون و ایدیکان د گل اوان : که او چتانی بـه
١١ رسولانیان گت * و او قصانه لکن اوان وکو بطال دیـار بون و
١٢ باوریان به وان ندکرد * بلّا پطروس هلستا و بو سر قبری لنگی دا .
و که خوار بووه کتانانی بتنی دی : و چو مالی خوی و عجایب دما
له سر او چتی که ببو *
١٣ و اوتا : هر داو روژیدا دو له وان بو دییکی شیصت تیر هاویشتنی
١٤ دور له اورشلیمی دچون که نیوی عماوس بو * و اوان د گل یکتری
١٥ قصه‌یان د کرد بحثی همو او چتانی که قوما بون * و بو که وختیکی
اوان پیکوه قصه و پرسیاریان د کرد : یسوع بو خوی نیزیك بو و د گل
١٦ اوان دچو * بلّا چـاوانی وان گیران هتـا کو اوی نـاسن *
١٧ و به وانی گت : او قصانی که انگو د گل یکتری قصان د کن
١٨ وختیکی درون چین ؟ و راوستان به روی خمناك * بلّا یکیك که

نیوی کلیوپاس بو جوابی دا و به وی گت : اری هر اتو تنیا غریب
ده اورشلیم دای و او چتانی که داو روژاندا لوی بون نازانی ؟ *
۱۹ و به وانی گت : چتانی چی ؟ و اوان به وییان گت : او چتانی بحثی
یسوع ناصری : پیاویکی که پیغمبریکی به قوت ده عمل و قصه دا
۲۰ لپیش خلای و همو قومی بو * و چلون کاهنانی گوره و مزنانی مه
۲۱ اویان به حکمی کشتنی تسلیم کرد و اویان له سیداری دا * بلا امه به
هومید دبوین که هەو بویایه که دبا اسرائیل خلاص بکا . و بجگه
له همو او چتانی اوه روژی سیمه له او وختی که او چتانه بون *
۲۲ و چند ژنانیش له مه امەیان ده تعجوبی خستوه که صبحینی زو لسر
۲۳ قبری بون * و که میتی وییان پیدا نکرد هاتن و دیان گت : کـه
۲٤ دیتویکی ملایکتانیشیان دیبو که کتیان که او زندوه * و هیندیك له
وان که دگل امه بون بو سر قبری چون و هر وکو او ژنـانش
۲۵ کتبویان پیدایان کرد : بلا اویان ندی * و او به وانی گت : ای کم
عاقلان و دلگرانان که باور بکن به همو چتی که پیغمبران کتویانه *
۲٦ اری لازم نبو که مسیح اوانه بکیشی و وەژور جلالی خوی بکوی ؟ *
۲۷ و دستی پی کرد له موسی و له همو پیغمبران و او چتانی بحثی خوی
۲۸ ده همو کتیباندا بو وان ترجمه دکرد * و نیزیکی او دیی بون که
۲۹ بو وی دچون : و او وای دیار کرد که دبا دورتر بچی * و زوریان
لی کرد دیان گت : دگل امه بمینه چونکه نیزیکی ایواریه و روژ
۳۰ الان درنگه . و وەژور کوت که دگل اوان بمینی * و بو که وختیکی

او لسر سفری د گل اوان رونیشتبو : نانی هلگرت : ممبارکی کرد :
۳۱ لتی کرد و دای به وان * و چاوانی وان کرانوه و اویان ناسی : و او
۳۲ له وان ون بو * و به یکتریان دگت : مگر دلّی مه دنیو مەدا ناسوتا
وختیکی دگل امه ده رییدا قصی دکرد و که کتیبانی بو مه
دکردوه ? *
۳۳ و هر داو ساعاتیدا هلستان و بو اورشلیمی گَرانوه و او یازدانه
۳٤ و اوانی که دگل اوان بون پیدایان کرد که خر بونوه * و دیان گت:
۳٥ به راستی رب هلستاوتوه و به شمعونی بیندراوه * و اوان لو چتانی که
ده رییدا بون خبریان دا و چلون به لت کردنی نانی له وان ناسرا
۳٦ بووه * و که اوان لو چتانه قصەیان دکرد : او بو خوی لنیو اوان
۳۷ راوستا و به وانی گت : سلام علیکم * بلّا لرزاو و ترساو بون و
۳۸ فکریان دکرد که روحیکیان ددی * و او به وانی گت : بو چی تیك
۳۹ دچن و لبر چی ده دلّی انگودا فکرانی شك هلدستن ? * ببینن دستان
و پیانی من که امن بو خومم . دست له من بدن و ببینن چونکه
٤۰ روحیك گوشت و ایسکی نیه وکو دبینن که امن همه * و که اوی
٤۱ گت دستان و پیانی به وان نیشان دا * و که اوان هیشتا له خوشحالی
باوریان ندکرد و عجایب دمان به وانی گت : اری چتیکی خواردنیو
٤۲:٤۳ هیه لیره ? * و اوان لتیکی ماسی سور کراو به وییان دا * و وریگرت
و له بر چاوی وان خواردی *
٤٤ و به واني گت : اوانه قصاني منن که دگل انگو قصم کرد

وختیکی هیشتا دگل انگو بوم : لازمه که همو او چتانی کــه ده
شریعتی موسی و ده پیغمبران و ده زبوراندا بحثی من نوسراون تواو
٤٥ :٤٦ ببن * او دمی عقلی وانی کردوه که کتیبان بفامن * و به وانی
گت : وها نوسراوه که مسیح اذیت دکیشی و ده روژی سیمدا له نیو
٤٧ مردوان هلدستیتَـوه * و که به نیوی وی توبـَی بو بخشینی گناحان
لنیو همو ملّتان وعظ دکری : دست پی کردن له اورشلیمی دبی *
٤٨ :٤٩ انگو شایدانی او چتا نه هـَن * و اوتا امن وعدی بابی خوم له سر
انگو دنیرم : بلّا انگو ده شاریدا رونیشن هتا به قوت له بلندی دهبر
کراو دبن *
٥٠ و اوانی برده دری هتا کن بیتعنیا و دستانی خوی هلینا و اوانی
٥١ ممبارك کرد * و بو که وختیکی او اوانی ممبارك دکرد : له وان
٥٢ جوی بووه و وهسر بردرا بو آسمانی * و اوان سجدهیان لی کرد و به
٥٣ خوشحالییکی گوره بو اورشلیمی گـَرانوه * و همیشه ده هیکلیدا بون
و شکری خلّایان دکرد *

# انجیل یوحنا

## باب ۱

۱ ده هولیدا کلمه هبو : و او کلمه لکن خلاّی بو : و کلمه خلاّ بو *
۳:۲ اوه ده هولیدا لکن خلاّی بو * همو چتیك به وی بو و بی وی هیچ
چتیك نبو له وی که بوه *
۵:٤ ده ویدا ژیان بو و او ژیا نه رونا کای بنی آدمی بو* و او رونا کای
٦ ده تاریکایدا رونا کای ددا و تاریکای ده اوی نگیشت * پیاویك بو:
۷ له لای خلاّی ناردراو : نیوی یوحنّا بو * او بو سایدی هات که له
سر او رونا کای شایدی بدا هتا کو همو به سببی وی ایمان بینن *
۸ او او رونا کای نبو : بلاّ هات که له سر رونا کای شایـدی بدا *
۹ او رونا کای راست که هر کسیك رونـاك د کا : بو نیو دنیـایی
دهاتِ *
۱۱:۱۰ ده دنیایدا بو : و دنیا به وی بو : و دنیا اوی نناسی * بو کن
۱۲ یاخوی هات و ایخوی اویان قبول نکرد * بلاّ هر کامیکی که اویان
قبول کرد به وان حکماتی دا که بینه مندالانی خلاّی یعنی به وانی
۱۳ که به نیوی وی ایمان بینن * اوانی که نه له خوین و نه له ارادی
بدن و نه له ارادی انسان بلاّ له خلاّی بولد بون *

۱٤ و او کلمه بو به بدن و منزلی لنیو مه گرت و جلالی ویمان دی :
۱٥ جلالیکی و کو ای تاقانیِ له باب : پر له رحِم و راستی * یوحنّا له سر
اوی شایدی دا و قیژاندی دیگت : او هو بو که بحثی ویم گت : اوی
که له دوای من دی له پیش امن بوه : چونکه له من پیشتر بو *
۱٦ چونکه له پری وی هومان قبولمان کردوه : و رحم له جي رحم *
۱۷ چونکه شریعت به موسی درا : رحم و راستی به یسوع مسیح بو *
۱۸ هیچکس قط خلاّی ندیوه . کوری تاقانی که ده باوشی بابی دایه
او اوی اشکرا کردوه *
۱۹ و اویه شایدي یوحنّا وختیکی یهودیان له اورشلیمی کاهنان و
۲۰ لیویا نیان نارده کن اوی که لی بپرسن : اتو کیی ? * و اقراری کرد
۲۱ و حاشای نکرد و اقراری کرد : امن مسیح نیم * و لییان پرسی :
دنا چی ? اری اتو الیاسی ? و کتی : نیم . اری اتو او پیغمبری ?
۲۲ و جوابی دا : نه خیر * او دمی به وییان گت : اتو کیی ? هتا کو
جواب بدین به اوانی که امه‌یان ناردوه . چی دلّي بحثی خوت ? *
۲۳ کتی : امن دنگی بانگکریکم که ده چولیدا دلّی : ریی رب راست
۲٤ بکن : چلونیکی اشعیا پیغمبر کتی * و ناردراوان له فریسیان بون *
۲٥ و لییان پرسی و به وییان گت : اگر اتو مسیح نی : و نه الیاس و
۲٦ نه او پیغمبر : دنـا بو چی تعمیـد د کی ? * یوحنّـا بـه وان
جوابی دا دیگت : امن به آوی تعمید د کم . لنیوو و کسیك راوستاوه
۲۷ که انگو نایناسن * اوی که له دوای من دی : که امن لایق نیم که

٢٨ بندی کوشی وی بکموه * او چتانه ده بیت‌عنیا دا بون : لو لای اردن
لکوی که یوحنّا بو و تعمیدی دکرد *
٢٩ ده روژی دیدا یوحنّا یسوعی دی که دهاته کن اوی و کتی :
٣٠ اوتا برخی خلّای که گناحی دنیایی هلدگری * اویه اوی که بحثی
وی امن کتم : له دوای من کسیك دی که له پیش امن بوه چونکه
٣١ له من پیشتر بو * و امن اوم ندناسی : بلّا هتا کو بو اسرائیل اشکرا
ببی : لبر اوی امن هاتوم و به آوی تعمید دکم *
٣٢ و یوحنّا شایدی دا دیگت : روحم دی وکو کوتریك له آسمانی
٣٣ دهاته خواری و لسر اوی گیر بو * و امن اوم ندناسی : بلّا اوی
که امنی نارد که به آوی تعمید بکم : هر او به منی گت : لسر
کی که دبینی که روح دیته خواری و لسر اوی گیر دبی : اویه اوی
٣٤ که به روح‌القدوس تعمید دکا * و امن دیومه و شایدیم داوه که اوه
کوری خلّای یه *
٣٥ ده روژی دیدا دیسان یوحنّا راوستابو و دو له شاگردانی وی *
٣٦ و که تماشای یسوعی دکرد که دگَرا کتی : اوتا برخی خلّای *
٣٧ و او دو شاگردانه قصی کردنی وییان بیست و وه‌دوای یسوع کوتن*
٣٨ و که یسوع ورگَرا : اوانی دی که وه‌دوای دکوتن و به وانی گت :
له چی دگَرین ؟ به وییان گت : ربّی : که ترجمی اویه : ای
٣٩ ماموستا : منزلت لکوی یه ؟ * به وانی گت : ورن و دبینن . او دمی
هاتن و دیتیان منزلی لکوی بو : و اوی روژی لکن اوی مان و

۴۰ نیزیکی سعاتی دەیم بو * یکیك لو دوانی که له یوحنّایان بیست و
۴۱ که وەدوای وی کوتن اندریّاس برای شمعون پطروس بو * اوه
هولی برای خوی شمعونی پیدا کرد و به وی گت : مسیح : که به
۴۲ ترجمه کرستوسه : پیدامان کردوه * و اوی بو کن یسوعی برد .
یسوع تماشای وی کرد و کتی : اتو شمعون کوری یوحنّای : اتو
کیفا بانگ دکري : که به ترجمه پطروسه *
۴۳ ده روژی دیدا ویستی که بو جلیلی بروا و فیلپوسی پیدا کرد . و
۴۴ یسوع به وی گت : وەدوای من بکوه * و فیلپوس له بیت‌صیدا بو :
۴۵ له شاری اندریّاس و پطروس * فیلپوس نتنائیلی پیدا کرد و به وی
گت : اوی که موسی بحثی وی ده توراتدا نوسیوه و پیغمبرانیش
۴۶ پیدامان کردوه یعنی یسوع کوری یوسف له ناصرتی * و نتنائیل به
وی گت : اری ممکنه که چتیکی چاك له ناصرتی ببی ? فیلپوس به
۴۷ وی گت : وره و ببینه * یسوع نتنائیلی دی که دهاته کن اوی و
بحثی وی گت : اوتا به راستی اسرائیلیکی که حیله ده ویدا نیه *
۴۸ نتنائیل به وی گت : اتو امن له کوی دناسی ? یسوع جوابی دا و به
وی گت : له پیش اوی که فیلپوس اتوی بانگ کرد : که هیشتا
۴۹ لبن دارەهنجیری بوی : اتوم دی * نتنائیل به وی جوابی دا : ربّی :
۵۰ اتوی کوری خلای : اتوی پادشای اسرائیل * یسوع جوابی دا و به
وی گت : اری چونکه به توم گت : که اتوم لبن دارەهنجیری دی
۵۱ ایمان دینی ? چتانی گورەتر له وان دبینی * و به وی گت : راستی

راستی به انگو دلّیم : له وی پاش انگو آسمانی اواله کراو دیبنن
و که ملایکتانی خلّای لسر کوری انسانی بو سر و بو خواری دین *

## باب ۲

۱ و ده روژی سیمدا داوتیك ده قانای جلیلیدا بو و دایکی یسوع لوی
۲:۳ بو * و یسوع و شاگردانی ویش بو داوتی بانگ ایشتران * و که
٤ شراپ کم بو دایکی یسوع به وی گت : شراپیان نیه * یسوع به
وی گت : ای ژن : چم دگل تو هیه ؟ سعاتی من هیشتا نهاتوه *
٥ دایکی وی به خذمتکارانی گت : هر چی که به انگو بلّی بیکن *
٦ بلّا شش کوپی برد وکو عادتی پاك کردنوی یهودیان لوی داندرا
۷ بون که هر یکیك دو یان سَی مَشکانی دگرت * یسوع به وانی گت:
۸ کوپان پر بکن له آوی . و اوانیان پر کرد هتا سر لیوان * و به وانی
گت : اویستا هلبکیشن و ببنه کن گوری مجلیس و اوان بردیان *
۹ امّا وختیکی گوری مجلیس او آوی که ببو به شراپ تامی کرد
و نیدزانی له کوی یه : بلّا خذمتکارانی که آوییان هلکیشا بو :
۱۰ دیانزانی : گوری مجلیس زاوای بانگك کرد * و به وی گت :
هر کس هولی شراپی چاك پیش دادنی و وختیکی مست بون اوی
۱۱ خراپتر . اتو شراپی چاك هتا اویستات راگرتوه * یسوع او دست پی
کردنی نیشانان ده قانای جلیلیدا کرد و جلالی خوی اشکرا کرد و
شاگردانی وی ایمانیان به وی هینا *

۱۲ له پاش اوی چو خواری بو کفر ناحومی بو خوی و دایکی و برایانی
۱۳ و شاگردانی . و زور روژان لوی نمان * و فصحی یهودیان نیزیك بو
۱٤ و یسوع وەسر کوت بو اورشلیمی * و ده هیکلیدا گا و مر و کوتر
۱۵ فروشانی پیدا کرد و صرافان رونیشتو * و قامچیکی له بنی درست
کرد و هموانی له هیکلی در کرد : مران و گایانیش : و دراوی
۱٦ صرافانی رشته دری و تختانی ور گیرا * و به کوتر فروشانی گت :
اوانه هلگرن له ایره . مـالی بابی من به مـالی تجارتی مکن *
۱۷ شاگردانی وی وەبیریان هاتـوه که نوسراوه : غیرتی مالی تو امن
۱۸ دخوا * او دمی یهودیان جواییان دا و به وییان گت : چی معجزیك
۱۹ به مه نیشان ددی که او چتانه دکی ؟ * یسوع جوابی دا و به وانی
۲۰ گت : او هیکلی بروخینن و به سـَی روژان هلی دستینموه * او دمی
یهودیان کتیان : او هیکله به چل و شش سالان درست کراوه و
۲۱ اری اتو به سـَی روژان هلی دستینیوه ؟ * بلّا او بحثی هیکلی بدنی
۲۲ خوی قصی دکرد * لبر اوی وختیکی له نیو مردوان هل‌استا ندرا بووه
شاگردانی وی وەبیریان هاتـوه که اوی کتبو : و به کتیب و باو قصی
که یسوع کتبوی ایمانیان هینا *

۲۳ و که ده اورشلیمی ده جیژنی فصحیدا بو : زوران به نیوی وی
۲٤ ایمانیان هینا وختیکی او نیشانانی وییان دی که دیکرد * بلّا یسوع
۲۵ خوي به وان بدسپارد لبر اوی که او همو کسی دناسی * و چونکه

محتاج نبو که کسیك بحثی انسان شایدی بدا چونکه او بو خوی
دیزانی ده انساندا چی بو *

## باب ٣

١ و پیاویك له فریسیان هبو : نیوی نیقودیموس : مزنیکی یهودیان *
٢ اوه ده شویدا هاته کن اوی و به وی گت : ربّی : دزانین که اتو
ماموستایکی له خلّا هاتوی چونکه کس ناتوانی او نیشانان بکا که
٣ اتو دکی اگر خلّا دگل اوی نبی * یسوع جوابی دا و به وی گت :
راستی راستی به تو دلّیم : اگر کسیك له تازیَوه بولد نبی ناتوانی
٤ پادشایتی خلّای ببینی * نیقودیموس به وی گت : چلون دتوانی
کسیك بولد ببی وختیکی پیره ؟ اری دتوانی جاری دویم وەژور
٥ زگی دایکی خوی بکوی و بولد ببی ؟ * یسوع جوابی دا : راستی
راستی به تو دلّیم : اگر کسیك له آو و روح بولد نبی ناتوانی وەژور
٦ پادشایتی خلّای بکوی * اوی که له بدن بولد بوه بدنه : و اوی که
٧ له روح بولد بوه روحه * تعجوب مبه که به توم گت : لازمه که انگو
٨ له تازیَوه بولد ببن * با بو هر جییکی که دیوی لی ددا و دنگی وی
دییی : بلّا نازانی له کوی دی و بو کوی دچی : وهایه هر کس
که له روح بولد بوه *
٩ نیقودیموس جوابی دا وبه وی گت : اوانه چلون دتوانن ببن ؟ *
١٠ یسوع جوابی دا و به وی گت : اری اتو ماموستای اسرائیلی و او

١١ چتانه نازانی ؟ * راستی راستی به تو دلّیم : اوی که دزانین قصان
دکین و اوی که دیومانه شایدی ددین و شایدیی مه انگو قبول ناکن *
١٢ اگر چتانی دنیایی به انگوم کتوه و باور ناکن : چلون باور دکن اگر
١٣ چتانی آسمانی به انگو بلّیم ؟ * و هیچکس نچوته سَری بو آسمانی
بجگه له اوی که له آسمانی هاته خواری یعنی کوری انسانی *
١٤ و چلونیکی موسی ده چولیدا مارکی بلند کرد : هر واش لازمه
١٥ که کوری انسانی بلند بکری * هتاکو هر کس که به وی ایمان
١٦ بینی ژیانی ابدي ببی * چونکه خلّا دنیایی وها حُباند که کوری
تاقانی خوی دا هتاکو هر کس که به وی ایمان بینی هلاك نبی بلّا
١٧ ژیانی ابدي ببی * چونکه خلّا کوری خوی نتارده دنیایی که حکم
لسر دنیایی بکا : بلّا که دنیایی به وی خلاص ببی * اوی که
به وی ایمان بینی حکم لسری ناکری : بلّا اوی که ایمانان نایینی
الان حکم لسری کراوه چونکه به نیوی کوری تاقانی خلّای ایمانی
١٩ نهیناوه * و حکم اویه که روناکای ده دنیایدا هاتوه و بنی آدمی
تاریکاییان له روناکای خوشتر ویست : چونکه عملی وان خراپ بون*
٢٠ چونکه هر کس که خراپی دکا : روناکای دبغضینی و بو کن
٢١ روناکای نایی هتاکو عملانی وی زم نکرین * بلّا اوی که راستی
دکا بو کن روناکای دی هتاکو عملانی وی اشکرا بین چونکه ده
خلّایدا کراون *

٢٢ له پاش اوانه یسوع و شاگردانی وی هاتنه ولاتی یهودیه و لوی

۲۳ دگل اوان رایدبوارد و تعمیدی دکرد * بلّا یوحنّاش ده عینــون
نیزیکی سالیم تعمیدی دکرد چونکه آوی زور لوی هبو و دهاتن
۲٤ و تعمید دکران * چونکه یوحنّا هیشتا ده بندیخانیدا نهاویشترا بو *
۲٥ او دمی له شاگردانی یوحنّا دگل یهودییك مباحثه‌یکی بو له سر
۲٦ پاك کردنوی * و هاتنه کن یوحنّا و به وییان گت : ای ماموستا
اوی که دگل اتو لو لای اردن بو : که اتو بو وی شایدت داوه :
۲۷ اوتا او تعمید دکا و هموان دینه کن اوی * یوحنّا جوابی دا و کتی :
کس ناتوانی چتیکی ورگری اگر له آسمانی به وی ندراوه *
۲۸ انگو بو خوتان بو من شایدی ددن که کتم : امن مسیح نیم بلّا لپیش
اوی ناردراوم *
۲۹ اوی که بوکی هیه زاوایه : بلّا دوستی زاوای که رادوستی و
گوی لي دگری : زور کیفخوشی دکا لبر دنگی زاوای . دنا او
۳۰ کیفخوشی من تواو بوه * لازمه که او گوره‌تر ببی و امن پچوکتر ببم*
۳۱ اوی که له سررا دی : لسر هموانه . اوی که له ارضی یه له ارضی
یه و له ارضی قصان دکا . اوی که له آسمانی دی لسر هموانه *
۳۲ او چتی که دیویه و بیستویه اوی شایدی ددا و شایدي وی کس قبول
۳۳ ناکا * اوی که شایدي وی قبول کردوه : موری کردوه که خلّا
۳٤ راسته * چونکه اوی که خلّا ناردوه کلامی خلّا قصان دکا * چونکه
۳٥ خلّا به پیوان روح ندا * باب کوری دخُبینی وهمو چتانی به دستی
۳٦ وی داوه * اوی که به کوری ایمان بینی ژیانی ابدي هیه : امّا اوی

که اطاعتی کوری نکا ژیانی ناپینی بلّا غضبی خـلّای لسر اوی
دمینی *

## باب ٤

١ دنا وختیکی رب زانی که فریسیان بیستبویان که یسوع له یوحنّا
٢ پتر شاگردانی پیدا دکرد و تعمید دکرد * هر چند یسوع بو خوی
٣ تعمیدی ندکرد بلّا شاگردانی وی * یهودیـَی بجی هیشت و دیسان
٤:٥ چو بو جلیلی * و لازم بو که به نیو سماریه دا رابیری * و هاته شاریکی
سماریـَی که نیوی سوخار بو : نیزیکی او ملکی که یعقوب به کوری
٦ خوی یوسفی دابو * و چالاوی یعقوب لوی بو . که یسوع له سفری
٧ ماندو بو لسر چالاوی رونیشت . به قد سعاتی ششم بو * ژنیك له
سماریه هات که آوی هلبکیشی . یسوع به وی گت : آو به من بده
٨ که بخوموه * چونکه شاگردانی وی بو شاری چوبون که خوراك
٩ بکرن * او دمی او ژنی سماری به وی گت : اتو که یهودییکی چلون
له من که ژنیکی سماریم آوی خواردنوی طلب دکی ؟ چونکه
١٠ یهودیان دگل سماریان به ری ناچن * یسوع جوابی دا و به وی
گت : اگر اتو خلاتی خلّات بزانیبایه و کییه که به تو دلّی : آو
به من بده که بخوموه : اتو له وی طلبت کردبایه و او به تو آوی
١١ زندوی ددا * ژنکه به وی گت : یا رب دولچـَت نیه و او چالاوه
١٢ قوله : دنا له کوی او آوی زندوت هیه ؟ * مگر اتو له بابی مه

یعقوب گوره‌تری که او چالاوی به مه دا و له وی خواردیوه بو خوی
۱۳ و اولادی و حیوانی ؟ * یسوع جوابی دا و به وی گت : هر کس
۱٤ که لو آوی بخواتوه دیسان تینو دبی * امّا هر کس که لو آوی که
امن به وی ددم بخواتوه هتا ابدی تینو نابی بلّا او آوی که به وی
۱۵ ددم دبیته کانیکی آو ده ویدا که بو ژیانی ابدی هلدقولی * ژنکه
به وی گت : یا رب : او آوی به من بده هتا کو تینو نبم و نَیمه ایره
۱٦ که آو هلبکیشم * او به وی گت : برو میردی خوت بانگ بکه
۱۷ و وره ایره * ژنکه جوابی دا و کتی : میردم نیه . یسوع به وی گت :
۱۸ چاکت گت که میردم نیه * چونکه پینج میردت بو و اوی کـه
۱۹ اویستات هیه میردی تو نیه : اوت راست کتوه * ژنکه به وی گت :
۲۰ یا رب : دبینم که اتو پیغمبری * بابانی مه لسر او کیوی سجده‌یان
کرد و انگو دلّین که ده اورشلیمی دایه او جي که لازمه لوی سجدی
۲۱ بکن * یسوع به وی گت : ای ژن : باور به من بکه که ساعاتیك دی
که انگو نه لسر او کیوی و نه ده اورشلیمیدا له باب سجدی د کن *
۲۲ انگو سجدی اوی د کن که نایناسن . امه سجدی اوی د کین کـه
۲۳ دیناسین چونکه خلّاصی له یهودیانه * بلّا ساعاتیك دی و اویستایه که
سجده کرانی راست به روح و به راستی له باب سجدی د کن چونکه
۲٤ باب او جوره سجده کرانی دوی * خلّا روحه و لازمه که اوانی که
۲۵ سجدی لی د کن : به روح و به راستی سجدی لی بکن * ژنکه به
وی گت : دزانم که مسیح : اوی که کرستوس بانگ د کری :

٢٦ دی . وختیکی او دی له همو چتان به مه خبر ددا * یسوع به وی
٢٧ گت : امن هـَوم که دگل اتو قصان دکم * و ده ویدا شاگردانی وی
هاتن و مات مان که دگل ژنیـــکی قصی دکرد . بلّا هیچکس
٢٨ نیگت : چت دوی ? یان بو چی دگل اوی قصان دکی ? * او دمی
ژنکه جری خوی بجی هیشت و چو بو شاری و به خلکی گت *
٢٩ ورن کسیکی ببینن که همو او چتانی که کردومه به منی گت . مگر
٣٠ اوه مسیح نیه ? * له شاری وه‌در کوتن و دهاتنه کن اوی *
٣١ داو بینیدا شاگردان طلبیان لی دکرد دیان گت : ربـّی بخو *
٣٢ بلّا او به وانی گت : امن خوراکی خواردنم هیه که انگو نایزانن *
٣٣ او دمی شاگردان به یکتریان گت : مگر کس چتیکی خواردنی
٣٤ بو وی هیناوه ? * یسوع به وانی گت : خوراکی من اویه که ارادی
٣٥ وی بکم که امنی ناردوه و کاری وی تواو بکم * اری انگو نالّین
چاوی خوتان هلینن و تماشای زویان بکن که سپین بو دروینی *
٣٦ الان دروینه‌کر حقی دستینی و حاصل بو ژیانی ابدی خر دکا هتاکو
که هیشتا چوار مانگی دیکه و دروبنه دی ? اوتا امن به انگو دلّیم :
٣٧ توچین و دروینه‌کر پیکوه خوشحال بین * چونکه لیره او قصه راسته
٣٨ که توچین یکیکه و دروینه‌کر یکیکی دیکه یه * امن انگوم ناردوه
که دروینی بکن اوی که زحمتو دگلی نکیشاوه . ایدیکان زحمتیان
کیشاوه و انگو وه‌ژور زحمتی وان کوتون *

٣٩ و له او شاری زوران له سماریان به وی ایمانیان هینا لبر قصی

او ژنی که شایدی ددا که همو او چتا نی که کردومه به منی گت *
٤٠ و که سماریان هاتنه کن اوی طلبیان لی کرد که لکن اوان بمینی :
٤١ و دو روژان لوی ما * و زورانی دیگه ایمانیان هینا لبر قصی وی *
٤٢ و به ژنکه‌یان گت : ایدی لبر قصی تو ایمان ناینین چونکه بو خومان
٤٣ بیستومانه و دزانین که به راستی اوه خلاصکری دنیایی یه * و له
٤٤ پاش او دو روژانه له اوی وه‌در کوت بو جلیلی * چونکه یسوع بو
٤٥ خوی شایدی دا که پیغمبریك ده وطنی خویدا حرمتی نیه * بلّا وختیکی
هاته جلیلی : جلیلیان اویان قبول کرد چونکه همو او چتانه‌یان دیبو
که ده اورشلیمی ده جیژنیدا کردبوی چونکه اوانیش بو جیژنی
هاتبون *
٤٦ و دیسان هاته قانای جلیلی : او جی که آوی کردبو به شراپ
و شاه‌زاده‌یك هبو که کوری وی ده کفرناخومیـــدا نخوش بو *
٤٧ وختیکی او بیستی که یسوع له یهودیه بو جلیلی هاتبو : چو کن اوی
و طلبی لی کرد که بیته خواری و کوری وی صاغ بکاتوه چونکه
٤٨ نیزیکی مردنی بو * یسوع به وی گت : اگر انگو نیشانان و عجایبان
٤٩ نبینن قط ایمان ناینن * شاه‌زاده به وی گت : یا رب : وره خواری
٥٠ له پیش اوی که مندالی من بمری * یسوع بـــه وی گت : برو :
کوری تو دژی . پیاو که باوری کرد باو قصی که یسوع به وی گت
٥١ و چو * و که دچو خواری : خذمتکارانی وی توشی بون دیان گت
٥٢ که مندالی وی دژی * او دمی پرسیاری له وان کرد له او سعاتی

که ده ویدا چاتر ببو : و به وییان گت : دوینی سعاتی حوتم نوبتی
٥٣ بری دا * او جار بابی زانی که هر داو سعاتیدا بو که یسوع به وی
گت : کوری تو دژی . و ایمانی هینا بو خوی و همو مالی وی *
٥٤ اوه دیسان نیشانی دویم بو که یسوع کردی وختیکی له یهودیه بو
جلیلی هات *

باب ٥

١ له پاش اوی جیژنی یهودیان بو و یسوع وه‌سر کوت بو اورشلیمی*
٢ و ده اورشلیمیدا لکن دروازی مران حَوضیك هیه که به عبرانی
٣ بیت‌حسدا بانگ دکری که پینج هیوانی هیه * ده واندا جمعیکی
زور له نخوشان : کویران : شلان و افلیجیان راکشا بون که چاوه‌نوری
٤ بزوتنی آوی بون * چونکه جار جار ملایکتیك داهاته خواری داو
حوضیدا و آوی دابزواند . و له پاش بزوتنی آوی هر کسیکی که
٥ هولی وه‌ژور کوت : له هر نخوشیکی که بیبایه صاغ دبو * و پیاویك
٦ لوی هبو که سی و هشت سال نخوشی بو * وختیکی یسوع اوی دی
که کوتوه و زانی که الان زور وخت لوی ببو : به وی گت : اری
٧ دتوی که صاغ ببی ؟ * نخوشکه به وی جوابی دا : یا رب : کسم
نیه که وختیکی آو دبزوتری امن ده حوضی باویژی . بلّا وختیکی
٨ امن دیم یکیکی دیکه له پیش امن دا دچیته خواری * یسوع به وی
٩ گت : هلسته دوشگی خوت هلگره و برو * و جی بجی او پیاوه صاغ
بووه و دوشگی خوی هلگرت و روی . و اوی روژی شمو بو *

۱۰ لبر اوی یهودیان باو پیاوی که صاغ ببووه کتیان : شمو یه و بو تو
۱۱ درست نیه که دوشگت هلگری * بلّا او به وان جوابی دا : اوی که
امنی صاغ کردوه هر او به منی گت : دوشگی خوت هلگره و برو *
۱۲ و پرسیاریان لی کرد : کییه او پیاوه که به توی گت: هلگره و برو؟*
۱۳ بلّا اوی که صاغ ببووه نیدزانی که کییه چونکه یسوع خوی وه‌لا
۱٤ کیشا لبر غلبای که داو جییدا بو * له پـاش اوی یسوع اوی ده
هیکلیدا پیدا کرد و به وی گت : اوتا صاغ بویوه ایدی گناح مکه
۱۵ هتا کو چتیکی خراپترت به سر نَیی * او پیاوه چو و به یهودیانی
۱٦ گت که یسوع بو که اوی صاغ کردبووه * و لبر اوی یهودیان به
۱۷ یسوع اذیتیان دا چونکه او چتانی ده شمویدا دکرد * بلّا او به وان
جوابی دا : بابی من هتا اویستا کار دکا و امنیش کـار دکم *
۱۸ لبر اوی یهودیان زیاتر حولیان ددا که اوی بکشن چونکه نه تنیا شموی
دشکاند بلّا خلّای به بابی خوشی بانگ دکرد و خوی برابری خلّای
دکرد *
۱۹ او دمی یسوع جوابی دا و به وانی گت : راستی راستی به انگو
دلّیم : کور له خوی ناتوانی چتیکی بکا : بلّا تنیا اوی که دبینی که
باب دکا : چونکه هر چی او دکا او چتی کوریش دکا و کو اوی *
۲۰ چونکه باب کوری دحُبینی و همو چتانی که بو خوی دکا : به وی
نیشان ددا . و کارانی گوره‌تر له اوانه به وی نیشان ددا هتا کو انگو
۲۱ عجایب بمینن * چونکه چلونیکی باب مردوان وه‌خبر دینی و زندوی

٢٢ دكاتوه هر واش كور اوانى كه ديَوى زندوى دكاتوه * چونكه
باب لسر هيچكس حكم ناكا بلّا همو حــكم به كــورى داوه *
٢٣ هتا كو هموان حرمتى كور بگرن و كو حزمتى باب دگرن . اوى كه
٢٤ حرمتى كور ناگرى : حرمتى باب كه اوى ناردوه ناگرى * راستى
راستى به انگو دلّيم : اوى كه له كلامى من گوى بگرى و ايمان
به وى بينى كه امنى ناردوه : ژيانى ابدي هيه و ده حكمى نكوى
٢٥ بلّا له مردنى بو ژيانى رابردوه * راستى راستى به انگو دلّيم : كه
سعاتيك دى و اويستاشه كه مردوان دنگى كورى خلّاى دبين و
٢٦ اوانى كه دبين دژينوه * چونكه چلونيكى باب ده خويدا ژيانى هيه
٢٧ هر واش به كورى داوه كه ژيان ده خويدا ببى * و به وى حكماتى
٢٨ داوه كه حكمى بكا : چونكه كورى انسانه * له اوى عجايب مبن
چونكه سعاتيك دى كه هموان كه ده قبران دان دنگى وى دبين *
٢٩ و وەدر دكون اوانى كه چاكەيان كردوه بو قيامتى ژيانى و اوانى
٣٠ كه خراپەيان كردوه بو قيامتى عاذابى * امن له خوم ناتوانم چتيكى
بكم . وكو دبيم وا حكم دكم و حكمى من حقه چونكه امن حولى
ارادى خوم نادم : بلّا ارادى وى كه امنى ناردوه *
٣٢:٣١ اگر امن له سر خوم شايدى بدم شايدي من راست نيه* يكيكى ديكه
هيه له سر امن شايدى ددا و دزانم كه او شايدى كه او له سر امن
٣٣ شايدى ددا راسته * انگو ناردوتانه كن يوحنّا و او بو راستى شايدى
٣٤ داوه * امّا امن شايدى له انسانى قبول ناكم : بلّا او چتانه دلّيم

۳۵ هتا کو انگو خلاص ببن * او چرایکی هلکراو و رونا کیدار بو و
انگو دتان‌ویست که هتا وختیکی ده روناکای وی دا کیفخوشی
۳۶ بکن * بلّا امن شایدی گوره‌ترم هیه له اوی ای یوحنّا : چونکه او
کارانی که باب به منی داوه که اوانه تواو بکم یعنی هر او کارانی
۳۷ که دیکم له سر امن شایدی ددن که باب امنی ناردوه * و باب
که امنی ناردوه بو خوی شایدی له سر امن داوه . دنگی وی قط
۳۸ نتان‌بیستوه و شکلی ویشو ندیوه * و کلامی وی ده انگودا راگیراو
۳۹ نیه : چونکه اوی که او ناردویه به وی ایمان ناینن * انگو کتیبان
سوارغ دکن چونکه انگو فکر دکن که ده واندا ژیانی ابدیو هیه :
۴۰ و هر اوانن که له سر امن شایدی ددن * و انگو راضی نین که بینه
۴۱:۴۲ کن امن هتا کو ژیانیو ببی * جلال له انسانی قبول ناکم * بلّا انگو
۴۳ دناسم که محبتی خلّای ده خوتاندا نیه * امن به نیوی بابی خـــوم
هاتوم : و انگو امن قبول ناکن . اگر یکیکی دیکه به نیوی خوی
۴۴ بی : اوی قبول دکن * انگو چلون دتوانن ایمان بینن که له یکتری
جلال قبول دکن و لو جلالی که له خلّای تنیا یه حول نادن ? *
۴۵ فکر مکن که امن لکن باب گلیی له انگو دکم . یکیك هیه که
گلیی له انگو دکا یعنی موسی : اوی که انگو هومیدو لسر داناوه *
۴۶ چونکه اگر انگو به موسی باورو کردبایه به منیشو بـــاور دکرد :
۴۷ چونکه او بحثی منی نوسیوه * بلّا اگر انگو به نوسینانی وی ایمان
نینن : به کلامی من چلون ایمان دینن ? *

## باب ٦

١ له پاش اوی یسوع چو بو او لای بحری جلیلی یعنی بحری طبریّه*
٢ و خلکیکی زور وه‌دوای وی دکوتن چونکه او نیشانانه‌یان ددی
٣ که لسر نخوشانی دکرد * و یسوع وه‌سر کیوی کوت و لوی دگل
٤ شاگردانی خوی رونیشت * و فصح : جیژنی یهودیان نیزیك بو *
٥ و که یسوع چاوی خوی هلینا و خلکیکی زوری دی که دهاتنه کن
اوی : به فیلپوسی گت : له کوی نان بکرین که اوانه بخون ? *
٦ بلّا اوی دگت که اوی تجربه بکا چونکه بو خوی دیزانی چی دبا
٧ بکا * فیلپوس به وی جوابی دا : دوصد دینار نان بو وان بس نیه
٨ هتا کو هر یك کمیکی بستینی * یکیك له شاگردانی وی : اندریّاس
٩ برای شمعون پطروس به وی گت * لیره کوریکی چکوله هیه که
پینج نانی جو و دو ماسي هیه : بلّا اوانه چن بو اونده زوران ? *
١٠ یسوع کتی : با خلکی روبنیشن . بلّا داو جییدا گیّای زور هبو و
١١ پیاوان به حساب به قد پینج هزار رونیشتن * او دمی یسوع او نانانی
هلگرت : و که شکری کردبو : بو رونیشتوانی بش کرد : و هر
١٢ واش لو ماسیان هر چندیکی که ویستیان * و که تیر بون به شاگردانی
خوی گت : او لتکانی که زیاد بون خر بکنَوه هتا کو چتیك ون
١٣ نبی * و خریان کرد و له لتکانی او پینج نانانی جو که زیاد بون له
اوانی که خواردبویان : دوازده زمبیلیان پر کردوه *

١٤ و که خلکی او نیشا نه‌یان دی که کردی کتیان : به راستی او
١٥ پیغمبری که دیته دنیایی اویه * دنا وختیکی یسوع تی گیشت که
دبا بین و اوی به زوری بگرن که بیکنه پادشا : دیسان چو سر کیوی
١٦ او بو خوی بتنی * بلّا وختیکی ایواری بو: شا گردانی وی چونه خواری
١٧ لکن بحری * و وه‌ژور گمییکی کوتن و بو او لای بحری بو
کفرناحومی دچون : و الان تاریك بو و یسوع هیشتا بو کن اوان
١٨ نهاتبو * و بحر له بایکی گوره که لی ددا زور تیکل دبو *
١٩ وختیکی به قد بیست و پینج یان سی تیر هاویشتنی صوله‌یان لی دابو
یسوع‌یان دی لسر بحری دگَرا و نیزیکی گمی دهات و ترسان *
٢٠:٢١ بلّا او به وانی گت : امنم مترسین * او دمی ویستیان که اوی ده
گمیدا قبول بکن و جی بجی گمی لکن او ارضی بو که بو اوی
دچون *
٢٢ ده روژی دیدا خلکی که لو بری بحری راوستابون دیتیان که
گمییکی دیکه لوی نبو بجگه له یکیك : و که یسوع دگل شا گردانی
خوی وه‌ژور گمی نکوتبو بلّا که شا گردانی وی بتنی چوبون *
٢٣ بلّا گمیانی دیکه هاتن له طبریی نیزیکی او جي که نانیان لوی
٢٤ خواردبو له پاش شکر کردنی رب * دنا وختیکی خلکی دیتیان که
نه یسوع لوی بو و نه شا گردانی ویشی : اوان وه‌سر گمیان کوتن
٢٥ و هاتنه کفرناحوم و حولی یسوع‌یان ددا * و که اویان لو لای بحری
٢٦ پیدا کرد به وییان گت : ربّی کنگی هاتویه ایره ؟ * یسوع به وان

جوابی دا و کتی : راستی راستی به انگو دلّیم : انگو حولی من ددن
نه لبر اوی که نیشا نانو دی : بلّا لبر اوی که له نانانو خوارد و تیر
٢٧ بون * کاری مکن بو او خوراکی که هلاك دبی بلّا بو او خوراکی
که هتا ژیانی ابدی دمینی : اوی که کوری انسانی به انگو ددا :
٢٨ چونکه باب یعنی خلّا اوی مور کردوه * او دمی به وییان گت :
٢٩ چی بکین هتاکو کارانی خلّای بجی بینین ? * یسوع جوابی دا و به
وانی گت : کاری خلّای اویه که ایمان بینن به اوی که او ناردویه *
٣٠ او دمی به وییان گت : دنا چی نیشانیکی دکی هتاکو ببینین و ایمان
٣١ به تو بینین ? چی کاریکی دکی ? * بابانی مه ده چولیدا منّه‌یان
خوارد چلونیکی نوسراوه : نانی له آسمانی به وان دا که بخون *
٣٢ یسوع به وانی گت : راستی راستی به انگو دلّیم : موسی او نانی له
آسمانی به انگو نداوه بلّا بابی من او نانی راست له آسمانی به انگو
٣٣ ددا * چونکه نانی خلّای اویه که له آسمانی دیته خواری و به دنیایی
٣٤ ژیانی ددا * او دمی به وییان گت : یا رب : او نانی همیشه به مه
٣٥ بده * یسوع به وانی گت : امنم نانی ژیانی : اوی که بیته کن امن
٣٦ برسی نابی و اوی که ایمان به من بینی قط تینو نابی * بلّا به انگوم
٣٧ گت : که امنیشو دیوه و ایمان ناینن * همو که باب به من ددا دیته
٣٨ کن امن : و اوی که بیته کن امن قط دری ناکم * چونکه له آسمانی
هاتومه خواری نه که ارادی خوم بکم بلّا ارادی وی که امنی ناردوه *
٣٩ و اویه ارادی وی که امنی ناردوه: که له همو اوی اوی که به منی داوه

٤٠ چتیکی ون نکم بلّا که ده روژی آخریدا اوی هلدستینموه * چونکه
ارادی بابی من اویه که هر کس که کوری ببینی و ایمان به وی
بینی ژیانی ابدي دبی : و که امن ده روژی آخریدا اوی هلدستینموه *
٤١ او دمی یهودیان له سر اوی بولابولیان د کرد چونکه کتی : امنم
٤٢ او نانی که له آسمانی هاتوته خواری * و دیان گت : اری اوه یسوع
کوری یوسف نیه که امه باب و دایکی دناسین ؟ دنا چلون دلّي
٤٣ که له آسمانی هاتومه خواری ؟ * یسوع جوابی دا و به وانی گت :
٤٤ د گل یکتریِ بولابولی مکن * هیچکس ناتوانی بیته کن امن اگر
باب که امنی ناردوه اوی نکیشی . و امن ده روژی آخریدا اوی
٤٥ هلدستینموه* ده پیغمبراندا نوسراوه : و هموان له خلّای تعلیم د کرین.
٤٦ هر کس که له باب بیستویه و فیر بوه دیته کن امن * نه که کسیك
٤٧ بابی دیوه . هر اوی که له خلّای یه او بابی دیوه * راستی راستی به
٤٨ انگو دلّیم : اوی که ایمان بینی ژیانی ابدي هیه * امنم نانی ژیانی*
٤٩:٥٠ بابانی انگو ده چولیدا منّه‌یان خوارد و مردن * اویه او نانی که
٥١ له آسمانی دیته خواری هتا کو کسیك له وی بخوا و نامری * امنم
او نانی زندو که له آسمانی هاتوته خواری . اگر کسیك لو نانی
بخوا : هتا ابدی دژی . و او نانی که امن ددم بو ژیانی دنیایی
بدنی منه *
٥٢ او دمی یهودیان د گل یکتری شریان کرد دیان گت:اوه چلون دتوانی
٥٣ بدنی خوی به مه بدا که بیخوین ؟ * یسوع به وانی گت : راستی

راستی به انگو دلّیم : اگر انگو بدنی کوری انسانی نخون و خوینی
٥٤ وی نخونوه : ده خوتاندا ژیانو نیه * اوی که بدنی من دخوا و خوینی
من دخواتوه ژیانی ابدي هیه و امن ده روژی آخریدا اوی هلدستینموه*
٥٥ چونکه بدنی من خواردنی راسته و خوینی من خواردنوی راسته *
٥٦ اوی که بدنی من دخوا و خوینی من دخواتوه : ده مندا دمینی و
٥٧ امن ده ویدا * چلونیکی بابی زندو امنی ناردوه و امن به سببی باب
دژیم : هر واش اوی که امن دخوا اویش به سببی من دژی *
٥٨ اویه او نانی که له آسمانی هاتوته خواری : نه وکو بابان خواردیان
و مردن . اوی که لو نانی بخوا : هتا ابدی دژی *
٥٩ او چتانی ده کنشتیکیدا گت وختیکی ده کفرناحومیدا تعلیمی
٦٠ ددا * و زوران له شاگردانی وی وختیکی بیستیان کتیان : او قصه
٦١ رقه : کی دتوانی گوی لی بگری ؟ * بلّا یسوع وختیکی ده خویدا
دیزانی که شاگردانی وی له سر او چتی بولابولیان دکرد به وانی
٦٢ گت : اری او چته انگو هلدنگوینی ؟ * دنا چلون دبی اگر کوری
٦٣ انسانی ببینن وەسر بکوی بو او جي که هولی لوی بو ؟ * روحه
که زندوی دکاتوه : بدن هیچ فایدی نیه . او قصانی که امن به
٦٤ انگوم کتوه روحه و ژیانه * بلّا له انگو هیندیك هن که ایمان نایننن .
چونکه یسوع له هولوه دیزانی کین اوانی که ایمان دینن و کییه
٦٥ که اوی تسلیم دکا * و کتی : لبر اوی به انگوم کتوه که کسیك
ناتوانی بیته کن امن اگر له باب به وی ندراوه *

٦٦ له او سببی زوران له شا گردانی وی بو پاشوه چون و ایدی د گل
٦٧ اوی ندگَـران * او دمی یسوع باو دوازدانی گت : اری انگوش
٦٨ دتا نوی که بچنوه ? * شمعون پطروس به وی جوابی دا : یا رب :
٦٩ بو کن کی بچین ? اتو کلامی ژیانی ابدیت هیه * و امه ایما نمان
٧٠ هیناوه و زانیومانه که اتو مقدسی خلّای * یسوع به وان جوابی دا :
اری امن انگو دوازدم هلنبژاردوه ? وٌ یکیك له انگو شیـطانه *
٧١ بلّا بحثی یهودا کوری شمعون اسخریوطی قصی د کرد چونکه او دبا
اوی تسلیم بکا و یکیك لو دوازدانه بو *

## باب ٧

١ و له پاش اوی : یسوع ده جلیلیدا د گَـرا : چونکه نیدویست که
ده یهودیه دا بگَـری لبر اوی که یهودیان حولیان ددا که بیکوژن *
٢:٣ و جیژنی یهودیان یعنی جیژنی کپرەشینی نیزیك بو * لبر اوی برایانی
وی به وییان گت : له ایره وەدر بکوه و برو بو یهودیه هتـا کو
٤ شاگردانی توش ببینن کارانی تو که دکی * چونکه هیچکس
چتیك به دزی ناکا و بو خوی دیوی که ناسراو ببی . اگر او چتانه
٥ دکی خوت بو دنیایی اشکرا بکه * چونکه برایانی ویش ایما نیان به
٦ وی ندهینا * او دمی یسوع به وانی گت : وختی من هیشتا نگیشتوه :
٧ بلّا وختی انگو همیشه حاضره * دنیایی ناتوانی انگو بغضینی بلّا
امن دبغضینی چونکه امن له سر اوی شایدی ددم که عملانی وی

۸ خراپن * انگو وەسر بکون بو او جیژنی . امن هیشتا بو او جیژنی
۹ وەسر نا کوم چونکه وختی من هیشتا تواو نبوه * و که اوانی به وان
کتبو : ده جلیلیدا ما *
۱۰ بلّا وختیکی برایانی وی وەسر کوتبونه جیژنی : او دمی اویش وەسر
۱۱ کوت : نه به اشکرای بلّا وکو به دزی * و یهودیان ده جیژنیدا له
۱۲ وی دگَـَران و دیان گت : او لکوی یه ؟ * و بولابولیکی زور له
سر اوی لنیو خلکی هبو . هیندیکیان دگت که چاکه و ایدیکان
۱۳ دیان گت : نه خیر : بلّا خلکی هلدخلتینی * امّا هیچکس بحثی وی
به اشکرا قصی ندکرد له ترسی یهودیان *
۱٤ بلّا که الان نیوی جیژنی بو یسوع وەسر کوت بو هیکلی و تعلیمی
۱۵ ددا * و یهودیان مات دمان دیان گت : اوه که نیخویندوه چلون
۱٦ کتیبان دزانی ؟ * یسوع به وان جوابی دا و کتی : تعلیمی من ایمن
۱۷ نیه بلّا ایوی که امنی ناردوه * اگر کسیك پیـوی ارادی وی بکا دزانی
بحثی او تعلیمی اگر له خلّای یه یـــان امن له خوم قصـــان دکم *
۱۸ اوی که بحثی خوی قصان دکا : بو جلالی خوی حول ددا : بلّا اوی
که بو جلالی وی که اوی ناردوه حول ددا او راسته و ناحقی ده
۱۹ ویدا نیه * اری موسی به انگو شریعتی نداوه ؟ و هیچکس له انگو
۲۰ شریعت ناکا . بو چی حول ددن که امن بکوژن ؟ * خلکی جوابیان
۲۱ دا : جنّت هیه . که حول ددا که اتو بکوژی ؟ * یسوع جوابی دا
۲۲ و به وانی گت : تاقه کاریکم کرد و هموتان مات دمینن * موسی

به انگو سنّتی داوه : نه وها که له موسی یه بلّا له بابان : و انگو ده
۲۳ روژی شمویدا کسیکی سنّت دکن * اگر کسیك ده روژی شمویدا
سنّت دکری هتاکو شریعتی موسی نشکیندری : اری له من رقو
هلدستی چونکه ده روژی شمویدا کسیکی تواوم صاغ کردوه ? *
۲٤ وکو دیاری حکمی مکن بلّا حکمیکی حق حکمی بکن *
۲۵ او دمی هیندیك له اهلی اورشلیمی دیان گت : اری اوه هو نیه
۲٦ که حول ددن که بیکوژن ? * و اوتا به اشکرا قصان دکا و هیچ
چتیك به وی نالّین . مگر مزنان به راستی تی گیشتون کــه اوه
۲۷ مسیحه ? * بلّا دزانین اوه له کوی یه : امّا وختیکی مسیح دی
۲۸ هیچکس نازانی له کوی یه * وختیکی یسوع ده هیکلیدا تعلیمی
ددا قیژاندی و دیگت : انگو امن دناسن و دشزانن له کویم . و له
خوم نهاتوم بلّا به راستی یکیکه که امنی ناردوه : اوی که انگو
۲۹ نایناسن * امن اوی دناسم : چونکه له ویم و او امنی نــاردوه *
۳۰ و حولیان ددا که اوی بگرن : بلّا هیچکس دستی لسر اوی ناویشت
۳۱ چونکه ساعتی وی هیشتا نهاتبو * بلّا زوران له خلکی به وی ایمانیان
هینا و کتیان : وختیکی مسیح دی اری پتر نیشانان دکا له اوی
کردویه ? *
۳۲ فریسیان بیستیان که خلکی او چتانی له سر اوی بولابولیان دکرد:
و کاهنانی گوره و فریسیان خذمتکارانیان نارد که اوی بگرن *
۳۳ او دمی یسوع کتی : ایدی وختیکی کم دگل انگوم و دچیمه کن

٣٤ اوی که امنی ناردوه * انگو بو من حول ددن و پیدا ناکِن : و
٣٥ لکوی که امنم انگو ناتوانن بین . او دمی یهودیان به یکتریان گت:
او بو کوی دچی که امه اوی پیدا ناکین . اری بو کن بلاوبوان لنیو
٣٦ یونانیان دچی و یونانیان تعلیم بدا ؟ * اوه چی قصیکه که کتی :
انگو بو من حول ددن و پیدا ناکن : و لکوی که امنم انگو ناتوانن
بین ؟ *
٣٧ و ده روژی آخر و گوری جیژنیدا یسوع راوستا و دیقیژانـد
٣٨ دیگت : اگر کسیك تینو بی با بیته کن امن و بخواتوه * اوی که
به من ایمان بینی چلونیکی کتیب کتویه : له زگی وی چومانی آوی
٣٩ زندو جاری دبی * بلّا اوی گت بحثی او روحی که اوانی دبا قبول
بکن که به وی ایمانیان هینا : چونکه روح هیشتا نهاتبو : چونکه یسوع
٤٠ هیشتا به جلال نببو * هیندیك له خلکی وختیکی او قصانهیان بیست
٤١ کتیان : به راستی اویه او پیغمبره * ایدیکان کتیان : اویه او مسیحه :
٤٢ بلّا هبون که کتیان : مگر مسیح له جلیلی دی ؟ * اری کتیب
نیکتوه که له توی داود و له بیتلحمی او دیی که داود لی بو مسیح
٤٣:٤٤ دی ؟ * دنا له سببی وی لنیو خلکی جوی بونوه بو * و هیندیك له
وان ویستیان که اوی بگرن بلّا هیچکس ستانی لسر اوی ناویشت*
٤٥ دنا خذمتکاران هاتنه کن کاهنانی گوره و فریسیان و اوانه به وانیان
٤٦ گت : لبر چی اوی نتانهیناوه ؟ * خذمتــکاران جوابیــان دا :
٤٧ هیچکس قط وها قصی ناکردوه وکو او پیاوه قصان دکا * او دمی

۴۸ فریسیان به وان جواییان دا : مگر انگوش هلخلتاندراون ؟ * اری
۴۹ کسیك له مزنان یان له فریسیان ایمانیان به وی هیناوه ؟ * بلّا او
۵۰ غلبایی که شریعت نازانن ملعونن * نیقودیموس : اوی که پیشتر
۵۱ بو کن اوی هاتبو و که یکیك له وان بو به وانی گت * اری شریعتی
مه لسر کسیك حکم دکا اگر هولی له وی نبیی و بزانی چي
۵۲ کردوه ؟ * جواییان دا و به وییان گت : اری اتوش له جلیلیی ؟
۵۳ سوراغ بکه و ببینه که له جلیلی هیچ پیغمبریك هلناستی * و هر یك
بو مالي خوی چون *

## باب ۸

۱:۲ و یسوع بو کیوی زیتونی چو * بلّا صبحینی زو دیسان هاته هیکلی
۳ و همو خلکی دهاتنه کن اوی و رونیشت و اوانی تعلیم ددا * و
خویندواران و فریسیان ژنیکیان هینا کن اوی که ده زناحدا گیرا
۴ بو . و که اویان له نیوی راگرتبو * به وییان گت : ای ماموستا :
۵ او ژنه وختیکی عملی زناحی دکرد گیرا * و موسی ده شریعتدا به
مه حکمی داوه که اوانه بردهباران بکین . دنا اتو چی دلّی * و
٦ امّا اوی کتیان که اوی تجربه بکن هتاکو لسر اوی گلییکیان ببی .
۷ بلّا یسوع خوار بوه و به قامکی لسر ارضی نوسی * امّا که هر
پرسیاریان لی دکرد راست بوه و به وانی گت : اوی له انگو که
۸ بی گناحه با او هولی بردیکی لسر اوی باویژی * و دیسان خوار

٩ بووه و لسر ارضی نوسی * بلّا وختیکی اویان بیست یك به یك وەدر
کوتن . دستیان پی کرد له پیران . و یسوع بتنی ما و ژنکه له نیوی
١٠ راوستاو * و که یسوع راست بووه به وی گت : ای ژن لکوین ؟
١١ اری هیچکس حکمی لسر اتو نکردوه ؟ * و او کتی : هیچکس
**ای** رب . و یسوع کتی : امنیش حکمی لسر اتو ناکم برو و له
وی پاش گناح مکه *
١٢ و یسوع دیسان دگل اوان قصی کرد دیگت : امن روناکای
دنیایم . اوی که وەدوای من بکوی قط ده تاریکایدا ناگَری :
١٣ بلّا روناکای ژیاني دبی * او دمی فریسیان به وییان گت : اتو له
١٤ سر خوت شایدی ددی . شایدي تو راست نیه * یسوع جوابی دا و به
وانی گت : هر چند امن له سر خوم شایدی ددم : شایدي من راسته :
چونکه دزانم له کوی هاتوم و بو کوی دچم . بلّا انگو نازانن له
١٥ کوی دیم یان بو کوی دچم * انگو وکو بدن حکمی دکن . امن
١٦ له سر هیچکس حکمی ناکم * و اگر امن حکمی بکم حکمی من
١٧ راسته : چونکه بتنی نیم بلّا امن و اوی که امنی ناردوه * و ده
١٨ شریعتی انگوشدا نوسراوه که شایدي دو کس راسته * امنم که له
سر خوم شایدی ددم : و باب که امنی ناردوه له سر امن شایدی
١٩ ددا * او دمی به وییان گت : بابی تو لکوی یه ؟ یسوع جوابی دا :
انگو نه امن دناسن و نه بابی من . اگر انگو امنو بناسیبایه : بابی
٢٠ منیشو دناسی * او قصانه ده جي خزینیدا قصی کرد وختیکی ده هیکلیدا

تعلیمی ددا : و هیچکس اوی نگرت چونکه سعاتی وی هیشتا
نهاتبو *
۲۱ دنا دیسان به وانی گت : امن دچم و انگو بو من حول ددن و
ده گناحی خوتا ندا دمرن . بو کوی که امن دچم انگو ناتوانن بین *
۲۲ او دمی یهودیان کتیان : اری خوی د کوژی که دلّی : بو کوی که
۲۳ امن دچم انگو ناتوانن بین ؟ * و به وانی گت : انگو له خوارون
۲٤ امن له سروم : انگو له او دنیاین امن له او دنیایی نیم * لبر اوی
به انگوم گت که ده گناحانی خوتا ندا دمرن . چونکه اگر ایمان
۲۵ نینن که امنم : ده گناحانی خوتا ندا دمرن * او دمی به ویان گت:
اتو کیی ؟ یسوع به وانی گت : هر اوی که له هولوه به انگوم کتوه*
۲٦ چتانی زورم هیه که درحقی انگو بلّیم و حکمی بکم بلّا اوی که
امنی ناردوه راسته و امن هر چی که له ویم بیستوه او چتانه به دنیایی
۲۷ قصان دکم * اوان تی ناگیشتن که بحثی باب دگل اوان قصی
۲۸ دکرد * او وختی یسوع به وانی گت : وختیکی کوری انسانیو بلند
کردوه او وختی تی دگن که امنم و که له خوموه هیچ چتیك ناکم
۲۹ بلّا او چتانه قصان دکم چلونیکی باب امنی تعلیم کردوه * و اوی
که امنی ناردوه دگل امنه . امنی بتنی بجی نهیشتوه : چونکه امن
۳۰ همیشه اوی دکم که پی خوشه * وختیکی او چتانی قصه دکرد زوران
به وی ایمانیان هینا *
۳۱ او دمی یسوع باو یهودیان که به وی ایمان هینر بون کتی : اگر

٣٢ انگو ده کلامی مندا بمینن : به راستی شاگردانی منن * و راستی تی
٣٣ دکن و او راستی انگو ازاد دکا * جواییان به وی دا : امه توی
ابراهیمین و قط ده عبدیتی کسدا نبوین . اتو چلون دلّی که انگو
٣٤ ازاد دبن ؟ * یسوع به وان جوابی دا : راستی راستی به انگو دلّیم :
٣٥ هر کس که گناح دکا عبدی گناحه * امّا عبد هتا ابد ده مالیدا
٣٦ نامینی : بلّا کور هتا ابد دمینی * دنا اگر کور انگو ازاد بکا : به
٣٧ راستی ازاد دبن * دزانم که انگو توی ابراهیمن : بلّا حول ددن
٣٨ که امن بکوژن چونکه کلامی من ده انگودا جی نگری * امن هر
چی که لکن بابم دیوه قصان دکم : و انگو هر چی که له بابو بیستوه
٣٩ دکن * جواییان دا و به وییان گت : بابی مه ابراهیمه . یسوع به وانی
گت : اگر انگو مندالانی ابراهیمی بیان عملانی ابراهیمیو دکرد *
٤٠ بلّا اویستا انگو حول ددن که امن بکوژن : پیاویکی که راستی به
انگو قصی کردوه اوی که له خلّام بیستوه : او چتی ابراهیم نکرد *
٤١ انگو عملانی بابی خوتان دکن . به وییان گت : امه له زناحی بولد
٤٢ نبوین . هر یك بابمان هیه یعنی خلّا * یسوع به وانی گت : اگر خلّا
بابی انگو بیایه انگو امنو دحباند : چونکه امن له خلّای وەدر کوتوم
٤٣ و هاتوم . چونکه له خوشموه نهاتوم بلّا او امنی ناردوه * انگو لبر چی
قصی کردنی من تی ناگن ؟ چونکه ناتوانن گوی له کلامی من
٤٤ بگرن * انگو له بابی خوتان شیطانن و دتانوی که طمایانی بابی
خوتان بکن . او له هولوه انسا نکوژ بو و ده راستیدا رانوستوه چونکه

راستی ده ویدا نیه . وختیکی درو قصان دکا له ایخوی قصان دکا
٤٥ چونکه دروزنه و بابی وی * بلاّ امن چونکه راستی قصان دکم انگو
٤٦ به من ایمان ناینن * کیهه له انگو دتوانی لبر گناح امن الزام بکا ؟
٤٧ و اگر راستی قصان دکم انگو لبر چی به من ایمان ناینن ؟ * اوی که
له خلاّی یه له کلامی خلاّی گوی دگری . لبر اوی انگو گوی
نگرن چونکه له خلاّی نین *
٤٨ یهودیان جوابیان دا و به وییان گت : اری امه چاك نالّین که اتو
٤٩ سماریی و جنّت هیه ؟ * یسوع جوابی دا : امن جنّم نیه بلاّ حرمتی
٥٠ بابی خوم دکم و انگو امن بی حرمت دکن * بلاّ امن حولی جلالی
٥١ خوم نادم . یکیك هیه که حولی وی ددا و حکمی دکا * راستی راستی
به انگو دلّیم : اگر کسیك کلامی من رابگری هتا ابد قط مردنی
٥٢ نابینی * یهودیان به وییان گت : اویستا دزانین که جنّت هیه .
ابراهیم مرد و پیغمبرانیش : و اتو دلّی : اگر کسیك کلامی من
٥٣ رابگری هتا ابد قط مردنی ناچیژی * اری اتو گوره‌تری له بابی
مه ابراهیم که مرد ؟ و پیغمبرانیش مردن . خوت به کی دکی ؟ *
٥٤ یسوع جوابی دا : اگر امن به خوم جلال بدم : جلالی من چتیك نیه .
بابی منه که جلال به من ددا : اوی که انگو بحثی وی دلّین :
٥٥ خلاّی مه یه * و انگو اوی ناناسن : بلاّ امن اوی دناسم : و اگر
بلّیم که اوی ناناسم : هر وکو انگو دروزن دبم . بلاّ اوی دناسم
٥٦ و کلامی وی راد گرم * بابی انگو ابراهیم کیفخوشی دکرد که روژی

٥٧ من ببینی و دیتی و خوشحال بو * او دمی یهودیان به ویان گت :
٥٨ هیشتا پینجا سالت نیه و اری ابراهیمت دیوه ? * یسوع به وانی گت :
٥٩ راستی راستی به انگو دلّیم : له پیش اوی که ابراهیم هبو امن هم *
٥٩ او دمی بردانیان هلگرت که لسر اوی باویژن بلّا یسوع خوی شاردوه
و له هیکلی وەدر کوت *

## باب ٩

٢:١ و که رادبرد پیاویکی دی که له زگماکی کویر بو * و شاگردانی
وی پرسیاریان لی کرد دیان گت : ربّی : کی گناحی کردوه اوه
٣ یان والدینی وی که کویر بولد بوه ? * یسوع جوابی دا : نه اوه
گناحی کردوه و نه والدینی ویش : بلّا هتا کو کاری خلّای ده ویدا
٤ اشکرا ببی * بو من لازمه که کاری وی که امنی ناردوه بجی بینم
که هیشتا روژه . شو دی وختیکی هیچکس ناتوانی کار بکا *
٦:٥ وختیکی ده دنیایی دام رونا کای دنیایم * و که اوی کتبو تفی
لسر ارضی کرد و قوری له تفی درست کرد و او قوری لسر چاوانی
٧ وی دانا * و به وی گت : برو بشو ده حوضی سلوامدا که به ترجمه
٨ یه : ناردراو . دنا چو شوشتی و هاتـوه و دیتی * او دمی جیرانان
و اوانی که پیشتر اویان دیبو که سوالکر بو کتیان : اری اوه هو نیه
٩ که رودنیشت و سوالی دکرد ? * هیندیك کتیان : هوه : ایدیکان
١٠ کتیان : نه خیر : بلّا و کو اویه . بو خوی کتی : امنم * او دمی به

١١ وییان گت : دنا چاوانی تو چلون کرانوه ? * او جوابی دا : پیاویکی
که به وی یسوع دڵین : قوری درست کرد و له چاوانی من مالی و
به منی گت : برو بو سلوامی و بشو . و که چوم و شوشتم دیتو بوم *
١٢ و به وییان گت : او لکوی یه ? کتی : نازانم *
١٣:١٤ اوی که پیشتر کویر ببو بردیانه کن فریسیان * و اوی روژی
١٥ شمو بو که یسوع قوری درست کرد و چاوانی وی کردوه * دیسان
فریسیانیش پرسیاریان لی کرد چلون دیتو ببو : و او به وانی گت :
١٦ قوری لسر چاوانی من دانا و شوشتم و دبینم * او دمی هیندیك له
فریسیان کتیان : او پیاوه له خلّای نیه چونکه شموی راناگری .
ایدیکان کتیان : چلون دتوانی پیاویکی گناحکار وها نیشانان بکا?
١٧ و جوی بونوی لنیو اوان بو * دنا دیسان باو کویرهیان گت : اتو
١٨ چی دڵي بحثی وی چونکه چاوانی توی کردوه ? * و او کتی :
١٨ پیغمبره: * او دمی یهودیان باوریان نکرد درحقی وی که کویر ببو
١٩ و دیتو بو هتا والدینی او دیتو بویيان بانگ کرد * و له وانیان
پرسی دیان گت : اری اوه کوری انگو یه که انگو دڵین که کویر
٢٠ بولد بو ? دنا اویستا چلون دبینی ?* والدینی وی جوابیان دا و کتیان:
٢١ دزانین که اوه کوری مه یه و که کویر بولد بو * بلّا چلون اویستا
دبینی نازانین : یان کی چاوانی وی کردوتوه امه نازانین . له
٢٢ خوی بپرسن : بالقه : با او بحثی خوی قصان بکا * والدینی وی اویان
گت لبر اوی که له یهودیان دترسان چونکه یهودیان الان وعدهیان

کردبو که اگر کسیك اوی به مسیح اقرار بکا : له کنشتی در بکری*
٢٣:٢٤ لبر اوی والدینی وی کتیان که بالقه : له خوی بپرسن * دنا جاری
دویم او پیاوی که کویر ببو بانگیان کرد و به وییان گت : جلّال
٢٥ به خلّای بده . ماه دزانین که او پیاوه گناحکاره * او جوابی دا :
اگر گناحکاره نازانم : یك چت دزانم که کویر بوم و الان دبینم *
٢٦ او دمی به وییان گت : به تو چی کرد ؟ چلون چاوانی توی کردوه؟*
٢٧ جوابی به وان دا : الان به انگوم کتوه و گویو نگرت . بو چی دیسان
دتانوی که ببین ؟ مگر انگوش دتانوی که شاگردانی وی بین ؟ *
٢٨ و جنیویان پی دا و کتیان : اتو شاگردی ویی بلّا امه شاگردانی
٢٩ موساین * امه دزانین که خلّا دگل موسی قصی کردوه بلّا نازانین اوه
٣٠ له کوی یه * او پیاوه جوابی دا و به وانی گت : ادی ده ویدا چتیکی
عجایبه که انگو نازانن له کوی یه : و چاوانی منی کردوتوه *
٣١ دزانین که خلّا له گناحکاران گوی ناگری بلّا اگر کسیك
٣٢ خلّاترس ببی و ارادی وی بکا له وی گوی دگری * له هولی دنیایی
٣٣ نابیستراوه که کسیك چاوانی کویری زگماکی کردبیتوه * اگر اوه
٣٤ له خلّای نبایه چتیکی تدتوانی بکا * جوابیان دا و به وییان گت :
اتو یکجار ده گناحاندا بولد بوی و اری اتو امه تعلیم ددی ؟ و اویان
٣٥ در کرد *
٣٥ یسوع بیستی که اویان در کردبو و که اوی پیدا کرد کتی :
٣٦ اری اتو به کوری انسانی ایمان دینی ؟ * او جوابی دا و کتی : یا

٣٧ رب : اری کینه که به وی ایمان بینم * یسوع به وی گت : اویشت
٣٨ دیوه و اوی که دگل اتو قصان دکا هوه * و او کتی : یا رب :
٣٩ ایمان دینم : و سجدی لی کرد * و یسوع کتی : امن بو حکم کردنی
هاتومه او دنیایی هتا کو اوانی که نایینن ببینن و اوانی که دیینن
٤٠ کویر بین * اوان له فریسیان که دگل اوی بون او چتا نه‌یان بیست
٤١ و به وییان گت : مگر امه‌ش کویرین ؟ * یسوع به وانی گت :
اگر انگو کویر بیان : هیچ گناحو ندبو بلّا اویستا دلّین که دیینین :
دنا گناحو دمینی *

باب ١٠

١ راستی راستی به انگو دلّیم : اوی که به درکی وه‌ژور اغلی مران
٢ ناکوی بلّا له جییکی دیکه وه‌سر دکوی : او دز و جرده یه * بلّا
٣ اوی که به درکی وه‌ژور دکوی شوانی مرانه * بو وی درکـوان
دکاتوه : و مران دنگی وی دبین و مرانی خوی به نیو بانگ دکا
٤ و اوان دباته دری * وختیکی همو ایخوی در کردوه لپیش اوان دچی
٥ و مران وه‌دوای وی دکون چونکه دنگی وی دناسن * امّا وه‌دوای
غریبیکی قط ناکون بلّا له وی هلدین چونکه دنگی غریبان ناناسن *
٦ یسوع او مثلی به وان گت بلّا اوان تی نگیشتن او چته چی بو که
دگل اوان قصی دکرد *
٧ لبر اوی یسوع به وانی گت : راستی راستی به انگو دلّیم : امنم

٨ در کی مران * همو اوانی که له پیشی من هاتون دز و جردانن : بلّا
٩ مران گوییان له وان نگرتوه * امنم در کی : اگر کسیك به من
وەژور بکوی خلاص دبی و وەژور و وەدر د کوی و لوری پیدا
١٠ د کا * دز نایی مگر که بدزی و سربری و هلاکی بکا . امن هاتوم
١١ که ژیانیان ببی و که زیدەیان ببی * امنم شوانی چاك . شوانی چاك
١٢ گیانی خوی بو مران دادنی * اوی که کریکاره و شوان نیه : که
مران ایوی نین دبینی که گرگ دی و مران بجی دیلی و هلدی
١٣ و گرگ اوان دگری و بلاو دکا * چونکه کریکاره و خمی مران
١٤ ناخوا * امنم شوانی چاك و ایخوم دناسم و لــه ایخوم ناسراوم *
١٥ چلونیکی باب امن دناسی و امن باب دناسم و گیانی خوم بو مران
١٦ دادنیم * مرانی دیکشم هیه که له او اغلی نین اوانیش دبی بینم
١٧ و دنگی من دبین و یك میگل و یك شوان دبی * لبر اوی باب
امن دحبینی : چونکه امن گیانی خوم دادنیم هتاکو دیسان اوی
١٨ بستینموه * هیچکس اوی له من ناستینی : بلّا امن له خوم اوی دادنیم.
حکماتم هیه که اوی دابنیم و حکماتم هیه که دیسان اوی بستینموه.
١٩ او حکمی له بابی خومم قبول کردوه * دیسان لنیو یهودیان لبر او
٢٠ قصانه جوی بونوی بو * و زوران له وان کتیان : جنّی هیه و شیته :
٢١ بو چی گوی له وی دگرن ؟ * ایدیکان کتیان : او قصانه ای جنّداری
نین . مگر جنّیك دتوانی چاوانی کویران بکاتوه ؟ *
٢٢ او وختی خیژنی ممبار کبادي هیکلی ده اورشلیمیدا بو و زستان بو*

۲۳:۲٤ و یسوع ده هیکلی ده هیوانی سلیما ندا د گَرا * او دمی یهودیان
دوری وییان گرت و به وییان گت : هتا کنگی گیـّانی مه ده شکدا
۲٥ رادگري ؟ اگر اتوی او مسیح : به اشکرا به مه بلّی * یسوع به
وان جوابی دا : به انگوم کتوه و ایمان نایننن . او کارانی که امن به
۲٦ نیوی بابی خوم د کم اوانه له سر امن شایدی ددن * بلّا انگو ایمان
۲۷ نایننن چونِکه له مرانی من نین * مرانی من دنگی من دیین و امن
۲۸ اوان دناسم و وەدوای من د کون * و امن ژیانی ابدی به وان ددم :
و هتا ابدی قط هلاك نابن : و هیچکس اوان له دستی من نارفینی *
۲۹ بابی من که اوانی به من داوه له هموان گورەتره و هیچکس ناتوانی
۳۰:۳۱ اوان له دستی باب برفینی * امن و باب یکین * دیسان یهودیان
۳۲ بردانیان هلگرت که اوی بردەباران بکن * یسوع به وان جوابی دا:
امن زور کارانی چاك له بابی خوم به انگوم نیشان داوه . اری لبر
۳۳ کیهه کاریکی له وان امن بردەباران د کن ؟ * یهودیان به وی جوابیان
دا : لبر کاریکی چاك اتو بردەباران ناکین : بلّا لبر کفر و چونکه
۳٤ اتو که انسانی خوت به خلّا د کی * یسوع به وان جوابی دا: اری ده
۳٥ شریعتی انگودا نانوسراوه : امن کتم : انگو خلّایا نن ؟ * اگر اوانی
به خلّایان بانگ کرد که کلامی خلّای بو وان هات : و کتیب ناتوانی
۳٦ بطال بکری * اری به وی که باب مقدسی کردوه و بو دنیایی ناردوه
۳۷ انگو دلّین که کفر دلّی چونکه کتم : کوری خلّام ؟ * اگر کارانی
۳۸ بابی خوم ناکم باور به من مکن * بلّا اگر دیکم : هر چند انگو به

